سەندیکای ئەندازیارانی کوردستان

KURDISTAN ENGINEERS UNION

ژمارە (٧-٨)ی ٢٠٠٤

المهندس

# ئەندازیار

گۆڤارێکی زانستی، ڕۆشنبیری، سەندیکایی وەرزییە سەندیکای ئەندازیارانی کوردستان دەریدەکات



## پرۆژەکانی بەشە ناوخۆییەکان و شێوازێکی مۆدێرن لە بیناسازیدا

## یەکەم ئەندازیاری پارێزگار..

## پرۆژەکانی کوردستان لە ڕاپرسییەکی ئەندازیاراندا



# ئەندازیار المهندس

گۆڤارێکی زانستی- رۆشنبیری  سەندیکایی وەرزییە
سەندیکای ئەندازیارانی کوردستان دەری دەکات


## رێنمایی و مەرجەکانی ناردن و بلاّوکردنەوەی تویژینەوە زانستی و بابەتەکان

- گۆڤاری ئەندازیار سەرجەم ئەم بابەت و توێژینەوانە بلأودەکاتەوە کە رەسەنن و ئاستێکی بەرزیان هەیەو تایبەتمەندن بەبوارە جیاجیاکانی ئەندازیاری (زانستی بنەڕەتی و پراکتیکی)، چ لە ناوەوە یان لە دەرەوەی هەرێمی کوردستان بێت. توێژینەوەکان لەلایەن پسپۆرانی تایبەتمەند هەڵدەسەنگێندرێن.
- بابەتەکان دەشێت بەزمانی کوردی، عەرەبی، ئینگلیزی نووسرابێت.
- پێویستە بابەتەکە لەسەر یەك ڕووی پەڕە بەخەتێکی جوان نووسرابێت و بەجوانی بخوێندرێتەوە، خۆ ئەگەر کۆمپیوتەر لەبەردەستدابێ، پیت چنین کرابێ و لەسەر (Disk) بنێرن بۆمان زۆر باشترەو سوپاستان دەکەین.
- سەبارەت بەوێنەو خشتە، با وێنەکان روون و بەقەبارەی گونجاوبن لەگەڵ نووسینی ناوونیشانیان و ئەگەر بەدیسك بێن ئەوا بەشێوەی JPGبن، هەروەها پێویستە خشتەکان بەشێوەیەکی پوخت و روون ئامادەکرابن و ناوونیشانیان لەسەر دیاری کرابێت.
- پێویستە سەرچاوەکان دیاری بکرێن، بەم شێوەیە: (ناوی نووسەر، ناوونیشانی سەرچاوە، ژمارە (بۆ گۆڤارو رۆژنامە) یان چاپەمەنیەکانی تر، جێگای بلاوبوونەوەی، ساڵ)، ئەگەر بکرێ بە شێوەی کاتی، سەرچاوەکان یان فۆتۆکۆپیەك لەو، بنێردرێت بۆمان، سوپاستان دەکەین.
- ئەو بابەتانە لە گۆڤاری ئەندازیار وەرناگیرێن کە پێشتر پێشکەش بە گۆڤارێکی تر کرابن و پەسندکراون بۆ بلاّوکردنەوە، یان بلاّوکراونەتەوە، یان رەت کراونەتەوە.
- ئەو بابەتانەی لەلایەن گۆڤاری ئەندازیار وەردەگیرێن، دەبنە مولکی گۆڤار بۆ خاوەنەکەی ناگەڕێندرێتەوە.
- ئەو بابەتانەی لە زمانی دیکەوە وەرگێڕدراون، پێویستە وێنەیەك لەبابەتە بنەڕەتییەکەی لەگەڵ دابێت.
- رێزبەندی بابەتەکان پەیوەندی بەلایەنی هونەریی نەخشەسازییەوە هەیە.




**بۆ پەیوەندی کردن بە گۆڤاری ئەندازیار:**

E-Mail
Andazyar2003@yahoo.com

تەلەفۆن و تێلێفاکس
Telefax: 2232255
Tel: 2230630
2222258

**ناونیشان:**
هەولێر - شەقامی شەست مەتری، بەرامبەر یاریگای نێودەوڵەتی شەهید فرەنسۆ هەریری، بارەگای سەندیکای ئەندازیارانی کوردستان.



نەخشەسازی و بەرگ
کۆمپیوتەری دەریا

## لەم ژمارەیەدا

# دوو ڕیان...؟!

**سەرنووسەر**

kamo_khoshnaw@yahoo.com

دوای لکاندنی کوردستانی باشوور بە دەوڵەتی عێراقی نوێ ساڵی ١٩٢٥، چارەنووسی گەلی کورد لەم بەشە زاڵمانە بە چارەنووسی عەرەبی عێراقی گرێدرا، بەڵکو زۆر کاتیش ئێمەی خاوەن خاك و مێژوو بە میوان و برا بچووك دادەنراین.

ئەم عێراقە دەستکردەی کە ئێستا عەرەبە شۆفینی و ئیسلامییە توندڕەوەکان سوێندی بە گیانی دەخۆن و پاراستنی یەکپریزیە درۆیەکەی خاکی بە ئەرکانی ئیمان حسێب دەکەن، ئێستاکە لەبەردەم دوو ڕیانێکی سەختدایە...

دوو ریانێك کە نەوەك هەر کاریگەری بەسەر عێراقدا دەبێت بەڵکو پرۆشکی دەپەڕێتەوە وڵاتانی دراوسێ و لەوانەیە جوگرافیاو ڕەوشی ناوچەکە بگۆڕێت.

ڕێگایەکیان بە ڕابەرایەتی توندڕەو بیرتەسك و کەمبینایانەو بەرەو دۆزەخی دونیا و قیامەتەوە دەڕوات، نەك ڕێبوارەکەی لەو دونیا بەرەو دۆزەخ دەبات، بەڵکو بە ئۆتۆمبێلی مینرێژکراو کاتیوشا و گوللە هاوەن و شیری حەجاج و کێردی ئەبو عەباسی سەفاح عێراق بەرەو دۆزەخ دەبات و دەرەنجامەکەی وێرانی و کاولکاری و ئاوارەیی و هەتیو بوون و خاپوورکردنی تەکیە و کڵێسا و بە جبەخانەکردنی قوتابخانە و مزگەوت و تەقاندنەوەی بۆری نەوت و وێستگەی کارەبایە، کە عێراقی نوقمی تاریکیەك دەکات مەگەر تەنیا لە ئاسۆی بیرکردنی وان بچێت...

ڕێگای دووەمیش بە ڕابەرایەتی ئەندازیارانە و ئاکامەکەی بەرەو بەهەشتی دونیا و قیامەت دەڕوات... ئەم ڕێگایەش نەوەك هەر ڕێبوارانی ، بەڵکو عێراق بە گشتی بەرەو بەهەشت دەبات، ڕێگای ئاوەدانکردنەوەی گوندە وێرانکرا و نۆژەنکردنەوەی شارە کاولکراوەکانە، ڕێگای دروستکردنی باخچەیەکی منداڵانە لەهەر بەندیخانەیەك، دانانی بەردی بناغەی نەخۆشخانەیەك لەهەر چاڵە تۆپێك، بنیاتنانی وێستگەیەکی کارەبا لە شوێن سەربازگەیەك، درێژکردنەوەی بۆری ئاوی خواردنەوە لە بری لوولە تۆپەکان....

ڕێگای ئەندازیارانی ماندوونەناس... ئەوانەی ئێستا عێراق بەرەو سەرفرازی دەبەن، ئەوە نییە سەرۆك کۆمار و جێگری سەرۆك کۆمارو جێگری سەرۆك وەزیران و نیوەی حکومەتەکەی ئێستای عێراق ئەندازیارن.

لە بەرامبەریش بەرەی ئیرهابی و پاشماوە دۆڕاوەکانی بەعس و نەوەکانی سەدام دەیانەوێت عێراق بەرەو چاڵە بەردینەکان بەرن..

دوو ڕیانە دوو ڕیان....

یا وڵاتەکەمان بەرەو ئیمارەتی تالیبان و میرنشینی زەراقینە دەڕوات....

یانیش بەرەو عێراقێکی دیموکراتی فیدراڵی ئازاد...



# کۆمەڵگەی بەشە ناوخۆییەکانی شەهید شەوکەت شێخ یەزدین

**حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ ئاوڕدانەوە لەهەموو چین و توێژەکانی ناو کۆمەڵگای کوردستان لە چەند ساڵی رابردوودا بەهەموو ئاراستەیەک لەم پێناوەدا کاری کردووە.**

بـواری خوێنـدن و پـەروەردە یـەك لـەو بوارانــە بــووە کــە لەلایــەن حکومــەتی کوردســـــتانەوە ئــــاوڕی بـــــەردەوامی لێدراوەتـــەوەو کـــاری لـــەپێناودا کــراوە، دروســـتکردنی قوتابخانـــەی نـــوێ لەســـەر نەخشـــەی ئەنـــــدازەیی هاوچــــەرچ و نۆژەنکردنـــەوەی قوتابخانـــە کۆنـــەکان و پەرەپێـــدان و گـــۆڕینی پرۆگرمـــەکانی خوێنـــدن و دابینکردنـــی پێداویســـتی و کەلوپـــەلی جۆراوجـــۆری ئـــەم بـــوارە، چاپکردنی کتێب و سەدان پیشەی دیکـەی حکومەت بووە لەساڵانی رابردوودا.

خوێنـــدنی زانکـــۆیش لـــە ئەجێنـــدای حکومەتدا بـەردەوام ئـاوڕی لێدراوەتـەوەو کاری لەپێناودا کراوە چەندین کۆلیژی نوێ کراونەتەوەو باڵەخانەی نوێ بۆ ژمارەیەکی بەرچـاوی کۆلیـژەکان دروسـتکراوە، ئەمـە وێـــڕای چـــەندین کـــاری دیکـــەی مـــەزن، ئێســـتاش بـــۆ ئاوڕدانـــەوەی زیـــاتر لـــە خوێنـــــدنی زانکـــــۆیی وەزارەتـــــی ئاوەدانکردنـــەوەو نیشـــتەجێکردن لەســـەر بودجـــــەی حکومـــــەتی کوردســـــــتان کۆمەڵگەیـــــەکی گـــــەورە بـــــۆ بەشـــــە ناوخۆییەکان بـەناوی شـەهیدی سـەرکردە شەوکەت شێخ یەزدین دروست دەکات.



ئەندازیار زانا عوزێری
بەڕێوەبەری گشتی بیناسازی

ئـــــەم کۆمەڵگایـــــە لەســـــەر نەخشـــەیەکی ئەنـــــدازەیی هاوچـــــەرخ و نـــویێ دروســـت دەکـــــرێ، رووبەری گشتی کۆمەڵگاکـە ۲۹۵۰۰ مـەتری چوارگۆشەیەو لەسێ باڵەخانـەی سـەرەکی پێکدێت، هەر باڵەخانەیـەك لەشـەش نهۆم پێکهـــاتووەو کـــۆی ژوورەکـــانی هـــەر


ئەندازیار عیماد نەجار

...ڵەخانەیەك ٢٥٠ ژوورە، بەمەش كۆی گشتی ژوورەكانی كۆمەڵگاكە دەكاتە ٧٥٠ ژوور، هەریەك لەسێ باڵەخانەكە پرسگەو كارگێڕی تایبەت بەخۆی هەیە، ئەمە جگە لە پرسگەی سەرەكی كۆمەڵگاكە لە بەشی كارگێڕی و پرسگەی هەر باڵەخانەیەك وێڕای چەند ژوورێكی تایبەت بە بەشەكە، شوێنی حەوانەوەو پێشوازی میوانان هەیە، لەكۆی گشتی باڵەخانەكەدا هەشت شوێنی تایبەت بە خوێندنی باڵا واتە تایبەت بە قوتابیانی دكتۆراو ماجستێر هەیە، ئەم شوێنانە وێڕای ژووری حەوانەوەو پشوو شوێنی چێشتخانەو گەرماوی تێدایە.

## هۆڵەكانی باڵەخانەكان:

لە دروستكردنی ئەم باڵەخانەیەدا رەچاوی هەموو لایەنەكانی پێداویستی قوتابیان كراوە، لە نهۆمی یەكەمدا كە نهۆمی ژێر زەمینە، ٢ هۆڵی گەورە دروستكراون، ئەم هۆڵانە بۆ جۆرەها چالاكی وەرزشی بەكاردەهێنرێ، هەر لەم نهۆمەدا ژووری تایبەت بە خۆگۆڕینی قوتابیان بۆ وەرزش كردن هەیە، ئەمە وێڕای دوو هۆڵی بچووك هەیە بۆ سەیركردنی تەلەفزیۆن، دەنگوباس و بەرنامەی جۆراوجۆر، ئەمە جگە لە هۆڵێك بۆ سیمینارو كۆبوونەوەو هۆڵێكی فرە بەكارهێنان كە بۆ وێنەكێشان و مۆسیقا بەكاردەهێنرێ، لەهەمان نهۆمدا ژووری پزیشك هەیە بۆ چارەسەرو پشكنینی قوتابیان، لەبەشێكی تری نهۆمی ژێر زەمیندا ژووری جل گۆڕین هەیە بەتاك و بەكۆ وێڕای ژووری ئوتوكردنی جلوبەرگ.

## نهۆمەكانی دیكە

لە نهۆمی یەكەمدا وێڕای ژوورەكانی نووستنی قوتابیان كە ژمارەیان ٥٣ ژوورە كتێبخانەیەكی گەورە هەیە بە رووبەری ١٢٦ مەتری چوارگۆشە. لەم كتێبخانەیەدا سەرجەم پێداویستیەكان دابینكراون، لەناو كتێبخانەكەدا ئۆفیسی تایبەت بە بەڕێوەبردن هەیە، لەنهۆمی دووهەمدا لەبری كتێبخانە بەهەمان رووبەر ئەنتەرنێت و كۆمپیوتەر هەیە لەگەڵ بەشی كارگێڕی تایبەت بەم بەشە. نهۆمەكانی دیكەش بەتەنیا ژوورەكانی نوستنی قوتابیانی تێدایە، وێڕای بوونی كۆمەڵێك گەرماوو WC، بۆ هەر هەشت ژووری نووستن چێشتخانەی تایبەت بە خۆی دامەزرێنراوە بەسەرجەم پێداویستییەكانییەوە، هەر ژوورێكی نووستنی قوتابیانیش كە دوو قوتابی لەخۆدەگرێت، دوو مێزی نووسین و دوو چەرپای نووستن و كەنتۆرێك لەخۆدەگرێ.



## نوێكارییەكانی كۆمەڵگاكە

ئەم كۆمەڵگایە وێڕای ئەوەی بەنەخشەیەكی ئەندازەیی هاوچەرخ دروست دەكرێ، لە هەمانكاتدا كۆمەڵێك تایبەتمەندی نوێی تێدا بەكارهێنراوە كە یەكەمین جارە لە باڵەخانەكانی ناو كوردستاندا كاری پێدەكرێ، لە مواسەفاتەكانی ئەم بەشە ناوخۆییە ئەوەیە كە هەر باڵەخانەیەك ئەسانسێری تایبەت بەخۆی هەیە، وێڕای دەرگای فریاكەوتن بۆ ئەگەری روودانی هەر كارەسات و رووداوێك.


ئەندازیار شیرین جەودەت

كۆی باڵەخانەكان لە پارچە كۆنكرێت دروست دەكرێ، بەبێ ئەوەی بلۆكی تێدا بەكاربهێنرێ. ژوورەكان لەسەر شێوازی نیو تۆنیل دروست دەكرێن، ئەمەش لەپێناو بەرگەگرتنی باڵەخانەكە بۆ رووداني زەمین لەرزە، ئەم شێوازە وادەكات زەمین لەرزە كار لە باڵەخانەكە نەكات. دیوارەكانی باڵەخانەكە لەسەر شێوازی سەندەویچ پەنال دادەمەزرێنرێ، ئەم شێوازە بەرگەی لەسەرماو گەرما و دەنگ دەكات و ناهێڵێ ئەم شتانە بێنە ناو باڵەخانەكەوە.



## کۆمەڵگایەک بێ ئاوەڕۆ:

تایبەتمەندی و نوێکارییەکی دیکە خۆی لە ئاستی ئاوەڕۆی باڵەخانەکاندا، هەموو بیناو باڵەخانەیەك ئاوەڕۆی تایبەت بەخۆی هەیە، بەڵام لەم کۆمەڵگایەدا ئاوەڕۆکان ناچنە دەرەوەی دیوارەکانی کۆمەڵگاکە. وەك ئەندازیاری بەڕێز زانا عوزێری بەڕێوەبەری گشت بیناسازی لە وەزارەتی ئاوەدانکردنەوەو نیشتەجێکردن ئاماژەی بۆ دەکات، کەوا بۆ ئەم کۆمەڵگایە هیچ ئاوەڕۆیەك لە دەرەوەی باڵەخانەکان دانەنراوە، بەڵکە ئامێری تایبەت بە پاڵاوتنی ئاوو پیسایی لەناو کۆمەڵگاکەدا دامەزرێنراوە کە ئاوەڕۆکان دەپاڵێوێ و دەیکاتەوە بە دووبەش، بەشێك ئاوی خاوێن کە بۆ ئاودانی باخ و سەوزاییەکانی ناو کۆمەڵگاکە بەکاردەهێنرێ و بەشی دووهەمیان دەبێتە پەینی کیمیاوی و ئەمیش بەهەمان شێوە سەوزایی باخچەی کۆمەڵگاکەدا بەکاردەهێنرێ.

لەلایەکی دیکەوە دەتوانین ئاماژە بە خاڵێکی تر بکەین، ئەویش دابینکردنی کارەبای بەردەوامە بۆ کۆی باڵەخانەکان ئەمیش لەڕێگای مۆلیدەی گەورەی کارەباییەوە، هەروەها سیستمی ساردی و گەرمی لە باڵەخانەکاندا ناوەندییە بۆ هەموو ژوورەکان دابەش دە کرێ.

## تێچوونی پرۆژەکە:

ئەم پرۆژە مەزن و هاوچەرخە لەسەر پلانی ئەندازەیی هاوچەرخی جیهانی بنیادنراوە، لەسەر بودجەی حکومەتی هەرێمی کوردستان و بەتێچوونی بڕی ١٢ ملیۆن دۆلار ئەنجام دەدرێت و کارەکانی پرۆژەکە ئێستا لە دواقۆناغ دایەو بڕیار وایە لە کۆتایی مانگی یانزەدا کۆمەڵگاکە بەتەواوی تەسلیم بە زانکۆی سەلاحەددین بکرێ.

جێگای ئاماژە پێدانە ئەم پرۆژە نایابە لەلایەن وەزارەتی ئاوەدانکردنەوەو نیشتەجێکردن سەرپەرشتی دروستکردنی دەکرێ و بەتەواوبوونیشی کۆی ١٥٨٠ قوتابی لەخۆدەگرێ کە قوتابیانی نیشتەجێبووی ئەم باڵەخانەیە پێویستیان بەهێنانی هیچ کەلوپەلێك نییە لەگەڵ خۆیان بۆ ناو کۆمەڵگاکە.



***سوپاسی هاوکاری بەشی ڕاگەیاندنی وەزارەتی ئاوەدانکردنەوەو نیشتەجێکردن دەکەین.**



# نۆژەنکردنەوەی پردی دەلال



ئەندازیاری راوێژکار
فارس سەعدی

بەگوێرەی سەرچاوەکانی شوێنەوارن مەزندەی ئەوە دەکرێ تەمەنی ئەم پردە زێتر لە (٢٠٠٠) ساڵ بێت، واتە زۆر دێرینە، دیارە ئەو بەردو کەرەستانەی لە دروست کردنی ئەم پرجە بەکارهاتوون زۆر خۆڕاگرو بەتینن، سەرەڕای ئەندازەی پردەکەش کە ئەمەشیان رۆڵی خۆی هەیە.

لەو یەك دوو ساڵەی دواییدا پێگەیەکی پردەکە لەژێرەوە لەناو ئاوەکە بەشێکی خورابوو، واتە ئاو بردبووی بەهۆی تەوژمی ئاوەڕۆی ئاوی رووبارەکە بەشێك لەبناغەی ئەم پێگەیە داخوڕابوو، ئەمە بووە هۆی داکەوتنی بەشێکی پردەکە کە بووە مایەی درز تێکەوتنی لەبەشێکی گرنگی پردەکە. ئەمە لەڕووی بیناسازییەوە، بەڵام لەڕووی شوێنەوارەوە هەروەك مامۆستا عەبدولرەقیب یوسف دەڵێ زۆر لەبەردی پردەکە نووسین و وێنەی لەسەر کێشراوە کە تائێستا کەس پەی پێ نەبردووە، نووسینەکان مەزندەی ئەوەی لێ دەکرێ پەهلەوی کۆن بێت.

ئەگەر زۆر بەوردی لە وردەکاری بیناسازی پردەکە ورد نەبیتەوە هەست بەو نووسین و وێنانە ناکرێ، بۆیە بەشێك لەپردەکە کاتی خۆی شێوێنراوە بەوەی درزی چیمەنتۆیان بۆ کردووە لەو کاتەی پردەکە بەقسڵ و گەچ بەردەکانی بەیەکەوە بەستراونەتەوە، بۆیە ئەم مادە تازەیە شتێکی نامۆیە لەڕووکاری پردەکە. هەروەها لەکاتی نۆژەن کردنەوەی ابردوودا زۆر بەردی بچووك بەکارهاتووە بۆ چاککردنەوەی پردەکە، هەندێکیان خشت نەکراون و رێك نەکراون وەك بەشە سەرەکیەکەی پردەکە، بۆیە کارێکی پێویستە ئەو بەردانە لێبکرێنەوەو بەردی تر لە شوێنی تر بۆ پردەکە بهێنرێت کە (متانە) واتە بەرگەی باوباران و لافاو بگرن و لەڕەنگی بەردە کۆنەکان بن، بۆیە لەم نۆژەنکردنەوەیە رەچاوی ئەو دوو خاڵە سەرەکییە دەکرێت.

ئەم پرۆژەیە لەسەر بودجەی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەڕێگای بەڵێندەرێك لە بەڕێوەبەرایەتی ئاوەدانکردنەوەو بیناسازی دهۆك ئەنجام دەدرێت. لەبەر کاری شوێنەواری لیژنەیەك لەسەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران و وەزارەتی رۆشنبیری کارەکانیان پێ راگرتن، داوایان کرد کە راستەوخۆ لەلایەن وەزارەتی رۆشنبیرییەوە جێبەجێبکرێت و لەژێر سەرپەرشتی لیژنەیەکی باڵای شوێنەوار کارەکان ئەنجام بدرێن، هەروەها ماوەی تەواوکردنی کارەکە دیاری نەکرێت لەسەر حیسابی جۆرو باشی برگە ئەنجام دراوەکان و کۆك بن لەگەڵ لایەنی شوێنەواری، بۆیە دووبارە لێکۆڵینەوە لەسەر پرۆژەکە کرا. دواجار وەزارەتی رۆشنبیری پێشنیاری کرد کەوا بە (تنفیذ مباشر) ئەنجامدانی راستەوخۆ وەزارەتی ئاوەدانکردنەوە ئەنجامی بدات، بەڵام لەژێر چاودێری لیژنەیەکی باڵای شوێنەوار بێت بۆ رەچاوکردنی لایەنی شوێنەواری پردەکە ئێستا خەریکە دەست دەکرێتەوە بەئەنجامدانی پرۆژەکە.

بۆ چارەسەرکردنی پێگەی سەرەکی پردەکە پێشنیار کراوە کەوا رێڕەوی ئاوی رووبارەکە بگۆڕدرێ بۆ لایەکی تر و شوێنە پەککەوتووەکە وشك بکرێتەوە، ئینجا بە کۆنکرێتی شیشدار کۆنکریت بکرێ بەمەرجێك دیار نەبێت و دواتر بەبەردی گەورە رووپۆش بکرێت لەهەر چوار دەورەی، ئینجا درزەکان بەقسڵ یا چیمەنتۆی سپی و غوبرە بەجوانی پڕبکرێتەوە، بەردە ئەشازەکانیش هەڵگیرێن و لەجیاتیان بەردی شیاوی لە (مقلع)ی دەوروبەری بهێنرێن، وەستای کارامە کاری تیابکات لەهەردوو رووەوە، بیناسازی و شوێنەوارەوە کارەکان کۆك بن و بەڕێوەبچن.




# پڕۆژەی سەنتەری بازرگانی لە شاری هەولێر

پـرۆژەی سـەنتەری بازرگـانی لەشـاری هـەولێر گـەورەترین پـرۆژەی بازرگانییـە لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستو لـەپرۆژە دەگمەنەکانیشـە لەسـەر ئاسـتی جیهـان بەهۆی گەورەیی ڕووبەرو ژمارەی ئەو یەکە بازرگانیانەی کە دەیگرێتە خۆ.

شـوێنی پرۆژەکـە دەکەوێتـە ناوجەرگـەی شاری هەولێر، بە سـێ شـەقامی سـەرەکی دەورە دراوە، ئـەوانیش شـەقامی (٣٠مەتری)و شەقامی سـەرەکی (هـەولێر- کەرکوک)و شەقامی شێخەڵلا.

بەمەبەستی دارشتنی نەخشەیێکی گونجاو بۆ ئەم پرۆژەیە، پێشبڕکێ یێکی بیناسازی ئەنجامدرا کـە تێیـدا چـەندین نووسـینگەی بیناسازی بەناوبانگ لەسەر ئاستی عـیراقو وڵاتـانی عـەرەبی بەشـدارییان تێـدا کـرد، دوای پێشکەشکردنی بیرۆکەکانو تاووتوێ کردنیان، نەخشـەی نووسینگەی (دوکتـۆر موسـەننا ئەلبـەیاتی) کـە بیناسـازێکی عیراقیەو نووسینگەی لـە ئـەبوزەبی هەیـە پەسند کرا.

ڕووبەری پرۆژەکە بریتییـە لـە (١٠٠٠٠٠)م٢ سەد هـەزار مـەتر دووجـا، لـە سـێ بەشـی سەرەکی پێك دێت:

١- سـێ نهـۆم لـەژێر زەوی بەڕووبـەری پرۆژەکە تەرخان دەکرێت بۆ وەستانی ئۆتۆمۆبیل، کە زیاتر لە (٩٠٠٠) نەوەد هـەزار ئۆتۆمۆبیـل دەگرێتـە خـۆو بـە شـەقامە سـەرەکیەکانەوە دەبەسترێتەوە.

٢-دوو نهـۆم لەسـەر ئاسـتی ڕووی زەوی بریتییە لە (٥٠٠٠) پێنج هـەزار یەکـەی بازرگانی (دوکان).

٣-چـوار تـاوەری شووشـە کـە بـەرزییان دەگاتـە (٢٥)م بیسـتو پێـنج مـەتر، ڕووبـەری هـەر نهۆمێـك (٣٠٠٠)م٢ سـێ هەزار مەتر دووجایە، بەشێوەی نهۆمی کراوەیە، واتە هەر دەزگاو کۆمپانیایێك



بەپێی ویستو ئارەزووی خۆی ناوبڕی بۆ دەکات.

جگە لەمە پڕۆژەکە گەلێ خزمەتگوزاری تر دەگرێتە خۆ لەوانە مزگەوتێکی گەورەو شوێنی حەوانەوەی دیکەی وەك ریستۆرانتو گازینۆو شوێنی دانیشتنو کوشك، کە کڕیار لەکاتی سووڕانەوەی لەنێو بازاڕەکەدا دەتوانێ سوودی لێ وەربگرێ.

نەخشەکێش لەدانانی نەخشەکەیدا ڕەچاوی ئەوەی کردووە یەکەی بیناسازی خۆماڵی بەکاربێنێو ئاوێتەی بکات لەگەڵ یەکەو ماددەی بیناسازی هاوچەرخ، دیارە نزیکی پڕۆژەکە لە قەڵاتو بازاڕی کۆنی هەولێر زیاتر ئەم بیرۆکەیەی بەرجەستە کردووە.

ئەم پڕۆژەیە کاریگەری یێکی زۆری بەسەر ژیانی ئابووریو کۆمەڵایەتی شاری هەولێردا هەیە، بەوەی شادەماری ئابوورییە بۆ شارەکەو وڵات بەگشتی، بەتایبەتی گەر بزانین بەشی زۆری بازاڕەکە فرۆشتنی بەکۆمەڵە. لەلایێکی دیکەوە ئەم پڕۆژەیە دەرفەتی کار فراوان دەکات لەبەردەم ئەندازیارو وەستاو کرێکار، بەمەش گرفتی بێکاری تاڕادەیێکی زۆر چارەسەر دەکات، وامەزەندە دەکرێت ڕۆژانە (٤٠٠٠٠) چل هەزار وەستاو کرێکار کاری تێدا بکەن. هەروەها دەرفەتی بەرهەمهێنان بۆ کارگەکانیش فراوان دەکات بۆ بەرهەمهێنانی کەرەستەی بیناسازی لەپێناو بەکارهێنانی بۆ جێبەجێ کردنی پڕۆژەکە.



# پڕۆژەی کۆڕی زانیاری کوردستان

ئەندازیاری سەرپەرشتیار
سلێمان مەعروف ئامۆزا

**کۆڕی زانیاری کورد خۆی لەخۆیدا پڕۆژەیەکی نەتەوەیی بەرزەو دامەزراندنی کۆڕی زانیاری کورد بیرۆکەکەی دەگەڕێتەوە ساڵی ١٩٧٤و یەکێك بوو لە دەستکەوتەکانی ڕێککەوتننامەی (١١)ی ئادار کە لە خزمەتی زانیاری و زانست و رۆشنبیری و فۆلکلۆری نەتەوەی کورددابوو.**

لەروانگەی کاراکردنی زیاتری ئەم دامەزراوە نەتەوەییانەو پێشخستنیان حکومەتی هەرێم بڕیاریدا باڵەخانەیەکی گونجاوو شایستە بەم دامەزراوە گرنگە دروست بکرێت.

دروستکردنی باڵەخانەی کۆڕی زانیازی کوردستان، یەکێکە لەو باڵەخانە گەورانەی کە لەم دواییەدا لەشاری هەولێر لەسەر بودجەی حکومەتی هەرێم دروستکراوە وەکو پڕۆژەکانی (بانکی هەرێم و کۆشکی هونەر و کۆشکی داد.....تاد).

وەزارەتی ئەشغال هەڵساوە بەنەخشەڕێژی (تصمیم) و جێبەجێکردنی پڕۆژەکە کە گوژمەی (١٥) ملیۆن دیناری چاپی سویسری بۆ تەرخان کراوە لەسەر رووبەری (٦٤٠٠) مەتر دووجا ئەنجام بدرێت و لەسەر رووبەری (٦٠٠٠) مەتر دوجا باڵەخانەیەکی سێ نهۆمی دروست کراوە.



## نهۆمەکانی ئەم باڵەخانەیە بەم شێوەیە:

نهۆمی ژێر زەوی بۆ چاپخانە دروستکراوەو دەشێت بکرێت بە کتێبخانە.

نهۆمی یەکەم بۆ کارەکانی بەڕێوەبەرایەتی ئەم دامەزراوە تەرخان کراوە.

نهۆمی دووەم بۆ سەرۆکی کۆڕو ئەندامانی لەگەڵ هەموو پێداویستییەکانی تەرخان کراوە.

نهۆمی سێیەم: بریتییە لە هۆڵی کۆبوونەوەی گشتی لەگەڵ حەوت ژوور.

ئەم باڵەخانەیە چوار هۆڵی هەشت گۆشەیی تێدایە کە لەهەر نهۆمێك هۆڵێك بەرووبەری ٢٠٠م٢ هەیەو هەر هۆڵێك بۆ مەبەستێکی تایبەت دانراوە (بۆ حەوانەوەی ئەندامان، کافیتریاو موتبەق، کتێبخانەی گشتی، گەلەری کەلوپەلی کەلتوری و کتێبی بەهاو بەنرخی کوردی).



١-دیوارەکانی دەرەوەی باڵەخانەکە بەلاری پلە ٩ کراوە و بەمەڕمەڕی ئیتاڵی رووپۆشکراوە.

٢- گومەزی کۆنکریتی شیشداری تیرە ٨م لەسەرەوە دانراوە، ئەمەش کراوەتە چوار بەش کە چاریەکی رووبەرەکەی بە شووشەی قۆقزی رەنگدار داپۆشراوە کە نمایش لە کوردستانی عێراق دەکات کە



ئازادبووەو سێ بەشەکەی دیکەی کوردستانی گەورە تائێستا لەژێر دەستی دایە. ئەم سێ بەشەی گومەزەکەش رووپۆشکراوە بە کاشی کەربەلایی رەنگاورەنگ. رووی ژوورەوەی ئەم گومەزە بەنەقشی مەغریبی رووکەش کراوە کە بەدەستی هونەرمەندانی هەولێر زۆر بەرێکوپێکی ئەنجامدراوە، لەلایەکی تری چل چرا (ثریا)یەکی گەورەی قەشەنگ لەبن میچی ئەم گومەزا هەڵواسراوە جێی ئاماژەیە ئەم گومەزە لەسەر هەشت کۆڵەکەی کۆنکریتی رووپۆشکراو لەمەرمەڕی ئیتالی راوەستاوە.

٣- دروستکردنی سەقفی ناوەندی بۆ هەموو ژوورو هۆڵەکان.

٤- دەرگای سەرەکی باڵەخانەکە لەجامەو بەشێوەیەك دانراوە کە دوو نهۆم دادەپۆشێت.

٥- دروستکردنی کافیتریا بەهەموو پێداویستییەکانەوە.

٦- پلیکانەکانی ژوورەوە بەکاشی نەخشرێژ (مطعم)و مەرمەڕ رووپۆشکراون و موحەجەرەکانیش لەداری ساجی نەخشکراو دروستکراوە.

٧- ژوورەکان هەمووی بەکاشی داچێنراو (مطعم) نەخشرێژ رووپۆشکراون.

٨- باڵەخانەکە چەندین باخچەی هەیە لە پێشەوەو تەنیشت کە گرنگییەکی تایبەتیان پێ بەخشراوە کە مەرمەڕەکانی ناوی بەکاشی شتایگەری رەنگی داپۆشراوە تا دەگاتە شۆستەی شەقامی دەرەکی بەردەم باڵەخانەکە.

٩- ئەسانسێری کارەبایی لەم بالەخانەیە هەیە ئەمە جگە لە تۆڕی دابەشکردنی هێڵی ئنتەرنێت کە لە کارەبای سەرەکی و گێنەرەتۆری تایبەت کارەبا وەردەگرێت.



چالاکی



* پەیمانگای تراینگل بۆ توێژینەوە (RTI) بەهەماهەنگی لەگەڵ سەندیکای ئەندازیارانی کوردستان خولێکی پەرەپێدانی بابەتەکانی پرۆژەی حوکمڕانی ناوەخۆ بۆماوەی ٦ هەفتە بۆ ئەندازیاران سازدا.

لەم خولەدا کە دەیان ئەندازیار بەشداریان تیاکرد هەفتانە دوو رۆژ گفتوگۆی تێروتەسەڵ لە بوارەکانی (دیموکراسی و مافی مرۆڤ و یەکسانی توخم و دەستورو حوکمی یاساو دەیەها بابەتی ترکە بنەماکانی دیموکراسی لە کۆمەڵ دەچەسپێنێ.

# سیستەمی ئەی بی ئێس لەبرێکی ئۆتۆمۆبێلدا

## Antilock Brake System (ABS)



### دەستپێک:

لەم چەند ساڵەی دواییدا باوی سیستەمی ( ABS ) سەری هەڵدا و برەوی پەیدا کرد لەکڕین و فرۆشتنی ئۆتۆمبێلدا. ئێستاش ئەگەر هەر ئۆتۆمبێلێک دەزگای برێکەکەی لەو جۆرە نەبێت برەوی کەم دەبێتەوە و نەختێکیش لەنرخەکەی دادەبەزێت. کەواتە ئەو سیستەمە بووە بەناکارێکی بازاڕ خۆشکەر بۆ ئۆتۆمبێلە نوێیەکان.

**د. شێرکۆ بابان**
**پرۆفیسۆری یاریدەدەر**
**لەئەندازیاری میکانیك دا**

ئەوەش لەیاد نەکەین کە سیستەمی (ABS) بریتی نییە لەسیستەمی برێك و جێی ئەو دەزگایەی نەگرتووەتەوە. لەبەرانبەردا، ئەو سیستەمە بریتییە لەباڵێکی یاریدەدەر بۆ سیستەمی برێك و بەبێ ئەوەش برێك هەر ئیش دەکات و زۆر ئۆتۆمبیل هەیە کە ئەو سیستەمەی لێ نەبەستراوە. کەواتە، سیستەمی (ABS) بریتییە لەئەو یاریدەدەرەی کەباری چەسپاندنی دەزگای (برێك) بەجۆرێکی تازەو شێوازێکی گونجاوتر پیادە دەکات. ئەو شێوازە گونجاوەش بریتییە لە (نەهێشتنی خشاندنی تایەکان) لەکاتی برێك گرتندا. بەواتایەکی دی سیستەمی (ABS) باری خشاندنی هەر چوار پاچکەکە بەجودایی سەودا دەکات و هەر یەکێکیان کە بگاتە سنووری (خشاندن) بەرەڵای دەکات تا نەخشێت. هەر لەبەر ئەوەیە کە سیستەمەکە ناونراوە ( Antilock Brake System). واتای ئەم زاراوەیە بریتیە لە (سیستەمی برێکی دژە خشاندن) و کورتکراوەی (ABS)یش لەجیاتی ئەو زاراوە درێژە بەکار هێنراوەو جیهانی گرتووەتەوە.

### هۆیەکانی داهێنانی (ABS):

بێگومان داهێنانی ئەم سیستەمە پێش کەوتووە هۆکاری بابەتی خۆی هەبووەو ئەگەر وانەبا ئەم ئامێرە ئاڵۆزەو ئەم خەرجییە زیادەیان نەدەخستە سەر ئۆتۆمبیلە تازەکان. بۆ تێگەیشتن لەهۆکارەکانی ئەم داهێنانە دەبێت لەیەکەم هەنگاودا لەکردەوەی (برێك گرتن) بگەین و بزانین مەرجی وەستانی




ئۆتۆمبیل چییە. لەسەرەتادا دەتوانین (برێك گرتن) دابەش بکەین بەسەر دوو قۆناغ دا وەك:

قۆناغی یەکەم: کاتێك کە شوفێرەکە برێك دەگرێت و هێزی پێی دەگات سەر بەنزەکان، خێرایی خولانەوەی پاچکەکە کەم دەبێتەوەو تا لەکۆتاییدا پاچکەکە لەخولانەوە رادەوەستێت و خێرایەکەی دەبێت بە (سفر).

قۆناغی دووەم: لەپاش ئەوەی خێرایی پاچکەکە دەبێت بە (سفر). وزەی تاودانی ئۆتۆمبیلەکە بۆ پێشەوە پاڵ دەنێت و پاچکە وەستێنراوەکە بەزەبری (خشاندن) دەبات بۆ پێشەوە. لەئەم قۆناغەدا دەنگی خشانی تایەکە بەئاشکرایی دەبیسترێت.

بێگومان جاری وا هەیە تەنها هەر قۆناغی یەکەم دەچەسپێت و قۆناغی دووەم ناچەسپێت. بەتایبەتی ئەگەر خێرایی ئۆتۆمبیلەکە کەم بێت، یان ئەگەر برێك گرتنەکە بەهێواشیو بەهێوری چەسپێنرابێت. ئەوەش لەیاد نەکەین دەرکەوتنی قۆناغی دووەم. واتە خشاندنی تایەکان. لەکاتی برێکی ناکات و لەپڕدا دەچەسپێت. ئەو جۆرە برێك گرتنەش لەکاتی رووداودا بەکاردەهێنرێت.

## کێشەکانی برێک گرتن:

لەکۆپلەی پێشەوەدا دوو قۆناغ لەکاتی برێک گرتن دیاری کران. یەکەمیان بریتی بوو لەقۆناغی هێواش کردنەوەی خولانەوەی تایەکان بەرەو (سفر) و دووەمیان بریتی بوو لەخشاندنی پاچەکان لەپاش ئەوەی کەخێرایی بوو بە (سفر). لەچەسپاندنی ئەم دوو قۆناغەدا هەندێك ڕاستی هەیە دەبێت بیان خەینە ڕوو، وەك:

**یەکەم:** قۆناغی یەکەم: کەبریتییە لەهێواش کردنەوەی خێرایی پاچەکان بەرەو (سفر) بریتییە لەقۆناغێکی زۆر کاریگەرو لەماوەیەکی کورت و لەدوورایییەکی کورتدا دەچەسپێت. ئەم ڕاستییەش دەبێت بەهۆی دەرباز بوون لەپێکدادان (تامپۆن) و نەگەیشتن بەئەو (کۆسپ)ەی لەپێناوی ئەودا برێك گیراوە.

**دووەم:** لەقۆناغی خشاندن دا کاتێك کەخێرایی پاچەکە دەبێت بە(سفر)، کاریگەری برێکەکە زۆر کەم دەبێتەوەو ئۆتۆمبیلەکە وەك تەنێکی بێ پاچەکە هێرش دەباتە سەر ئەو (کۆسپ)ەی کە لەپێناوی ئەودا برێك گیراوە.

**سێیەم:** لەکۆتایی قۆناغی یەکەم دا هەر چوار پاچەکە بەیەکەوە خێراییان نابێت بە (سفر). ئەمەش پەیوەندی هەیە بەکۆلکەی لێك خشاندنی نێوان (بەنزو دیسك) و کۆلکەی لێك خشانی نێوان (تایەو جادە). لەڕاستیدا وەك ئەم کۆلکانە لەئاستی هەر چوار پاچەکەدا جیاوازن هەر تایەیەك بۆی هەیە کە بەجودایی دەست بکات بە (خشان). ئەمەش وادەکات کە ئاراستەی ئۆتۆمبیلەکە بترازێت لەئاراستەی ڕێگاکەو ئۆتۆمبیلەکەش لەژێر ڕکێف دا نامێنێت.

چوارەم: لەسەر زەوی تەڕو جادەی لووس پاچەکان زۆر بەزوویی بەئاسانی هێواش دەبنەوەو خێرایییەکەیان دەبێت بە (سفر). ئەمەش وا دەکات کە لەکاتی باران دا قۆناغی یەکەم زۆر زۆر کورت ببێتەوەو کاریگەری برێك گرتنی نەمێنێت لەهەمان کات دا قۆناغ ی دووەم کەخۆی لەخۆیدا کاریگەری نییەو زیان بەخشە، زۆر درێژ ببێتەوە. هەر لەبەر ئەوە لەئەو ڕۆژانەدا کەجادە تەڕ بێت ڕووداوی ئۆتۆمبیل یەکەم جار زۆر دەبێت.

کەواتە ئەگەر بمانەوێت ڕووداوی ئۆتۆمبیل کەم بکەینەوە دەبێت دوو ڕێگا چارە بگرینە بەر:

یەکەم: هەر چوار پاچەکە پێکەوە لەهەمان کاتدا خێرایییەکەیان ببێت بە (سفر). ئەمەش کارێکی ئالۆزو دژوارەو پەیوەندی بەکۆلکەی لێك خشانی نێوان (بەنزو دیسك)ەوە هەیەو ئەم یەکسانیی و هاوسەنگییەو زۆر دژوارە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر ئەو یەکسانەیەش دابین کرا، ناتوانین کۆلکەی لێك خشانی نێوان (تایەو جادە) یەکسان بکەین لەئاستی هەر چوار پاچەکەدا.

دووەم: چارەسەری دووەم ئەوەیە کەقۆناغی دووەمی (ناکاریگەرو زیانبەخش) لاببەین و نەهێڵین بەهیچ جۆرێك تایەکان بخشێن لە ئەم چارەسەرەدا ڕێگاچارەی سیستەمی (ABS) داهێنراوە، کە بریتییە لە (سیستەمی برێکی دژەخشان). ئەم ئامێرە وا بنیادنراوەو وا نەخشەکێشراوە کە نەهێڵێت هیچ یەکێك لەپاچەکان بخشێت لەسەر جادەکە. بەواتایەکی دی هەر پاچەیەك کە خێراییەکەی بڕوات بەرەو (سفر)، زوو بەرەڵای دەکاتو ناهێڵێت ئۆتۆمبیلەکە بە (خشاندن) بوەستێتەوە بەڵکو ڕێی دەدات کە بە (هێواش بوونەوەی خوولانەوە پاچەکان) بوەستێتەوە.

کەواتە لەسیستەمی (ABS)دا قۆناغی یەکەمی (کاریگەرو سوود بەخش) کراوە بەبەرپرسی (١٠٠٪) بۆ وەستاندنەوەی ئۆتۆمبیل لەئاستی ئەو کۆسپەی کەدەهێتە سەر ڕێی و لەپێناویدا شوفێرەکە کردەوەی (برێك گرتن)ێکی لەناکاوی ئەنجام داوە.

## بنچینەی کارکردنی (ABS)

بنچینەی کارکردنی (ABS) لەئەوەدایە کە چوار پەیکە (دیسك) لەگەڵ هەر چوار پاچەکەدا دەخولێتەوە وەك (دیسکی برێك). ئەو چوار دیسکە موگناتیزین و بەنێو چوار کۆیلی هەستەوەردا دەخولێنەوە. کاتێك کەدیسکەکە دەخولێنەوە بەنێو کۆیلەکەدا تەزوویەکی کارەبای بگۆڕ پەیدا دەبێتو لەهەر چوار پاچەکەوە، ئەو تەزووە دەگات بەئامێرێکی کۆنترۆڵ. کاتێك کەشوفێرەکە برێك دەگرێت ئامێرەکەی کۆنترۆڵ ئەو چوار تەزووە کارەباییە بەراورد دەکات کە لەچوار ویلەکەوە پێی دەگەن. بێگومان لەرە لەری تەزووەکان لەگەڵ خێرایی دیسکەکاندا زیاد دەکات و ئەگەر هەر چوار ویلەکە هەمان لەرە لەرە بدەن ئەوا (برێك گرتن)ێکی ئاسایی دەچەسپێت. یان ئەگەر پاچەیەك بوەستێت و تەزووی کارەبا نەگات بەئامێری کۆنترۆڵ ئەوا کۆنترۆڵەکە یەکسەر ئەو پاچەیە بەردەدات، تا نەخشێت. بەئەم چەشنە ئامێری کۆنترۆڵ چەپڵە بە بەنزەکان لێ دەدات بە (گرتن:



ەردان)ی دووبارەیی و پەستانی هایدرۆلیکی کەم دەکاتەوە لەسەر ئەو پاچکەیەی کە خەریکە بوەستێت.
کەواتە دەتوانین بڵێین:
بەخولانەوەی چوار پاچکەکە چوار تەزووی کارەبای بگۆڕ ڕەوانە دەکرێت بۆ (یەکەی کۆنترۆل) و ئەم ئامێرەش لەرە لەری تەزووەکان بەراورد دەکات. ئەمجارە ئەگەر پاچکەیەك هێواش ببێتەوەو خێراییەکەی ببێت بە (سفر) ئەوا تەزوو نانێرێت و کۆنترۆڵەکە پێی دەزانێت و پەستانی لەسەر لادەبات تا خێراییەکەی نەبێت بە (سفر) و بەرەلای دەکات و لەهەمان کات کەخولایەوە دەی گرێتەوە. بە ئەم چەشنە کۆنترۆڵەکە هەر پاچکەیەك بەجودایی سەودا دەکات و ئەو پاچکەیەی کە بوەستێت چەپڵە بە بەنزەکەی لێ دەدات تا بەهێواش کردنەوە بوەستێت، نەك بەخشاندن.
بێگومان ئەم کردارە لەماوەیەکی زۆر کورت دا ڕوودەداتو لەئەو جێیەدا ئۆتۆمبیلەکە دادەکوتێت، بەبێ ئەوەی بهێڵێت (خشان) ڕووبدات لەنێوان تایەکان و جادەکەدا. بەواتایەکی دی قۆناغی یەکەمی برێك گرتن زۆر بەخەستی کاریگەر دەکرێت و ئۆتۆمبیلەکە دەوەستێتەوە، هەر چەندە جادەکە لووس بێت یان جادەکە تەڕ بێت.

## کێشەکانی سیستەمی (ABS)

سیستەمی (ABS) زۆر کاریگەرو بەکەڵکە بەتایبەتی ئەگەر خێرایی ئۆتۆمبیلەکە زۆر بەرز نەبێت یان برێکەکە لەپڕ نەگیرێت. گومان لەئەوەدا نییە کەکێشەکان لەکاتی ڕووداودا دەردەکەون و لەئەو کاتانەدا کەخێرایی بەرزەو شوفێرەکە بەبرێکی (لەپڕ) دەیەوێت خۆ دەرباز بکات لەکۆسپێکی زۆر نزیك. هەر لەبەر ئەوە چەند کێشەیەك پەیدا دەبێت و زۆر جاریش ڕووداوی جەرگبڕی لێ دەکەوێتەوە، وەك:
یەکەم: وەك سیستەمی (ABS) زۆر کاریگەرەو ئۆتۆمبیلەکە لەجێی خۆیدا دەوەستێت لەوانەیە ئۆتۆمبیلی پاشتر سیستەمی (ABS) نەبێت و پێیدا بتەقێت زۆر بەتوندی.
دووەم: وەك لەوڵاتی ئێمەدا نە شوفێرو نە نەفەران خۆ نابەستنەوەو پشتوێنەکە بەکار ناهێنن، لەکاتی برێکی کاریگەردا لەوانەیە نەفەرەکانی ئۆتۆمبیلەکە لەجامەکانەوە فڕێ بداتە دەرەوە. بێگومان هەر کێشێکی نەبەستراو و بەرەڵا بەرەو پێشەوە دەهاوێژرێت. لەڕاستیدا ڕووداوی لەئەم چەشنە زۆر بووەو تائێستا چەندین کەس گیانیان لەدەست داوە.




سێیەم: وەك لەوڵاتی ئێمەدا جادەکان خراپن و ڕێگاکان بە ڕاستەوخۆیی یەکتری دەبڕن و یاسای هاتووچۆ وەك پێویست پیادە ناکرێت، هەر شوفێرێك کە نەختێك خێرا لێ بخورێت تووشی چەند برێکی ناکات دەبێت. لەگەڵ ئەوەش دا لەوانەیە بۆ وەستانەوە لەئاستی تاسەیەك ڕووداوێك بەرپا ببێت. هەر لەبەر ئەوە زۆر دەبیستین کەبرێکێکی توند بووە بەهۆی کارەساتێکی جەرگبڕ بەبێ ئەوەی ئۆتۆمبیلەکە گەیشتبێت بەئەو کۆسپەی کەبرێکی بۆ گیراوە.

## بەرەنجام و پێشنیار

بەپێی ئەو خاڵانەی کە لەپێشەوە باس کران برێکی کاریگەری (ABS) جادەو ڕێگاوبانی پێشکەوتووی دەوێت. لەهەمان کات شوفێری باش و پشتوێن بەستنی دەوێت. لەوڵاتی ئێمەدا جادەکانمان پڕن لەکۆسپ و پڕن لەتاسەو ڕۆژێ چەندین جار برێك دەگرین. بەتایبەتی ئەگەر خێرایی ئۆتۆمبیل بەرز بێت و لە ١٠٠کم لە ساتێك زیاتر بێت لەجۆرە برێکی ئاوهادا نەفەرەکان لەئۆتۆمبیلە وەستاوەکە جودا دەبنەوە. هەر لەبەر ئەوە نابێت بەخێرایی لێ بخورین چونکە لەهەر (برێك گرتن)ێك دا لەوانەیە تووشی ڕووداو ببین. بۆ نموونە لەوانەیە لەجادەکانی نێوان شارەکان لەسەر ١٢٠کم/ سات لێ بخورین و لەناکاودا تاسەیەکی لەپڕ ببینین و یەکسەر برێك بگرین. لەهەڵوێستی ئاوهادت ئۆتۆمبیلەکە لەجێی خۆی دەوەستێت، بەڵام لەوانەیە نەفەرەکان زەرەرمەند ببن بەئەو ڕاوەستانە کاریگەرو چوستە. هەر لەبەر ئەوە پێشنیار دەکەین لە:
یەکەم: شوفێرەکەو نەفەرەکان پشتوێن ببەستن بەتایبەتی لەدەرەوەی شار. خۆزگا ئەو پیشتوێنە دەکرا بەیاساو بۆ ناوشارو دەرەوەی شار ببەسترابا.
دووەم: وەك جادەکانمان باش نین دەشێت خێرایی کەم بکەینەوەو پشت نەبەستین بەبرێکی (ABS) چونکە وەك کەڵکی هەیەو کاریگەرە، بەڵام لەخێرایی بەرزدا زیانی لەکەڵکی زۆرترە.
سێیەم: نەهێڵین بەهیچ جۆرێك منداڵ لەپێشەوە سوار بێت تەنانەت ئەگەر لەباوەشی دایکیدا بێت.
لەکۆتاییدا بەهیواین خزمەتێکی بچووکمان پێش کەش کردبێت چی بەناساندنی سیستەمی (ABS) لەڕووی زانستییەوەو چی لەڕووی ئەو کارەساتانەوە کە لەئەم جۆرە برێکەوە دەست پێ دەکەن.

سەرچاوە:
W.H Crouse & D.L Anglin, The auto book, MC. Graw Hill book company. U.S.A 1984.

# وزەی کارەباو پەین لەپاشماوەی فڕێدراودا

٧



**شوکر قەرەنی عەزیز**
**مامۆستا لەکۆلیژی ئەندازیاری**
**زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر**

**پێشەکی:**

چالاکییە جۆراوجۆرەکانی مرۆ لەژیانی رۆژانەیدا دەبێتە هۆی دروست بوونی جۆرەها پاشماوە، ئەو پاشماوانەش لەبڕو لەجۆردا جیاوازن لەنێوان خێزانێکی دەوڵەمەندو خێزانێکی هەژار، ناوچەیەکی پیشەسازی یان بازرگانیو ناوچەی دانیشتوان، شارو لادێ، پایتەختو شارێکی ئاساییو... هتد (وێنەی ١). پاشماوە ئەگەر بەشێوەیەکی ئاسایی لەسەر شەقامەکانو، کۆڵانەکانو گۆڕەپانەکان فڕێدران (ئەگەر لەشوێنێکی تایبەتیش کۆکراوە، بەڵام بەشێوەیەکی زانستی چارەسەر نەکرا) ئەوا کاریگەرییەکی زۆری دەبێت لەسەر ژینگەو دانیشتوان، بۆیە پێویستە کۆکردنەوە، گواستنەوەیو فڕێدانی بەشێوەیەکی رێکو پێکو لێکۆڵراوە بێت، تاوەکو لەجیاتی پیس بوونی ژینگە سوودی لێ



وێنەی (١) شوێنێکی کۆکردنەوەی پاشماوە

وەربگیرێت.

### تایبەتمەندییەکانو پێکهاتە

لەبڕگەی رابووردوو ئاماژە بەوە کرا کە جۆرو بڕی پاشماوە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی ترو لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر وەك یەك نییە، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ جۆری چالاکی مرۆ، وەرز، شوێن، باری ئابووری خێزانو چەند هۆکارێکی تر، سەرچاوەکانو جۆرەکانی پاشماوە لەخشتەی (١) روون کراوەتەوە. پاشماوەی سەوزەو میوە، شووشە، پلاستیك، دار، کانزا، کاغەز، خۆڵەمێش بەپێکهێنی سەرەکی پاشماوە دادەنرێن، رێژەی سەدی ئەو پێکهاتەش لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەگۆڕێت، خشتەی (٢) قەبارەی دەنکۆڵەکانی پێکهاتەی پاشماوە وەکو یەك نین، خشتەی (٣).

**خشتەی (١) سەرچاوەکانو جۆرەکانی پاشماوە**

| ز | سەرچاوە | پۆلینی سەرچاوە | جۆری پاشماوە |
| --- | --- | --- | --- |
| ١ | ماڵان | تاك خێزان، کۆمەڵێك خێزان، باڵاخانەی بەرز، مام ناوەندی، نزم | خۆراك، کاغەز، قووتو و مقەبا، شووشە، کانزا، تۆزو خۆڵی پاککردنەوە |
| ٢ | بازرگانی | دوکانەکان، چێشتخانەکان، بازاڕەکان، نووسینگە، پەیمانگاکان | خۆراك، کاغەز، قووتو و مقەبا، شووشە، کانزا، تۆزو خۆڵی پاککردنەوە |
| ٣ | پیشەسازی | کارگەکان، کارگەکانی ساف کردن، بەرهەمهێنانی کیمیاوی، کانەکان، بەرهەمهێنانی ووزە | پاشماوەی کرداری پیشەسازییەکان، کانزاکان، پلاستیك، چەوری، تۆزو خۆڵو پاشماوەی ورد. |
| ٤ | بنیاتنانو خاپوورکردن | | خۆڵ، کۆنکرێت، دار، ئاسن، پلاستیك، شووشە |

**خشتەی (٢) پێکهاتەی نموونەیی پاشماوەی ماڵان لەهەندێك وڵاتدا**

| ز | پێکهاتەی پاشماوە | ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (١٩٩٣) | دانمارك (١٩٩٢) | بەریتانیا (١٩٩١) | پۆڵەندا (١٩٩١) | چین (١٩٨٥) | ئیرلەندا دبلن (١٩٩٢) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | پاشماوەی خۆراك (٪) | ٩ | ٢٥ | ٢٥ | ٣٦ | ٣٦ | ٢٤,٢ |
| ٢ | کاغەز (٪) | ٤٠ | ٢٥ | ٢٩ | ١١ | ٢ | ١٨,٧ |
| ٣ | پلاستیك (٪) | ٧ | ٦ | ٧ | ٢ | ١,٥ | ١٦,١ |
| ٤ | شووشە (٪) | ٨ | ٨ | ١٠ | ٦ | ١ | ٥,٤ |
| ٥ | کانزا (٪) | ٩,٥ | ٤ | ٨ | ٢ | ١ | ٢,٩ |
| ٦ | قوماش (٪) | ٢ | ٨ | ٢ | ١٠ | ١,٥ | ٢,٦ |
| ٧ | تۆزو خۆڵەمێش (٪) | ٢ | ٤ | ١٤ | ٤٥ | ٥٧ | ١٧,٢ |
| ٨ | پۆلین نەکراو (٪) (باخچـــە، دار، گۆزەپان) | ٢١,٥ | | ٤ | | | ٢,٩ |

**خشتەی (٣) دابەش بوونی نموونەیی قەبارەی دەنکۆڵەکانی پاشماوە**

| ز | پێکهاتەی پاشماوە | مەودای قەبارە (ملم) | قەبارەی نموونەیی (ملم) |
|---|---|---|---|
| ١. | خۆراك | ٠ — ٢٠٠ | ١٠٠ |
| ٢. | کاغەزو مقەبا | ١٠٠ — ٥٠٠ | ٢٥٠ |
| ٣. | پلاستیك | ٠ — ٤٠٠ | ٢٠٠ |
| ٤. | شووشە | ٠ — ٢٠٠ | ١٠٠ |
| ٥. | کانزا | ٠ — ٢٠٠ | ١٠٠ |
| ٦. | قوماش | ٠ — ٣٠٠ | ١٥٠ |
| ٧. | تۆزو خۆڵەمێش (پاشماوەی سووتان) | ٠ — ١٠٠ | ٢٥ |

## کۆکردنەوەو گواستنەوە

ئەو پاشماوانەی لەماڵان پەیدا دەبێت پێویستە لەدەفری تایبەت دابنرێت، وێنەی (٢). بەڵام لەشوێنە بازرگانیو پیشەسازییەکان پێویستە ئەو پاشماوانە لەشوێنی تایبەت عەمبار بکرێنو ناوە ناوە بەتاڵ بکرێن. گواستنەوەی پاشماوەکانیش بەهۆی ئۆتۆمبیلی تایبەت دەبێت (وێنەی ژمارە ٣) بۆ شوێنی کۆکردنەوەو چارەسەرکردن.




وێنەی (٢) دەفری کۆکردنەوەی پاشماوەی ماڵان

## شوێنی کۆکردنەوەی پاشماوەکان

دوای ئـــەوەی پاشماوەکـــان لەماڵـەکان، شـوێنە پیشەسـازییەکان، بازرگانییـەکان، چـەقی شـارو شـوێنە خزمەتگوزارییـــەکان کۆدەکرێنـــەوەو دەگواسترێتەوە بـۆ شـوێنێکی تایبـەتی تـەرخان کـراو بـۆ ئـەو مەبەسـتە، ئـەو شـوێنە پێویسـتە تارادەیـەك دووربێـت لەچـەقی شـارو لـەدەرەوەی سـنووری شارەوانی بێت، ئاراستەی با بەجۆرێك بێت تۆزو خۆڵو مێشو مەگەز دووربکاتەوە لەشار، کاریگەری لەسەر ئاوی ژێر زەوی نەبێت، تۆپۆگرافی ناوچەکە بەشێوەیەك بێت ئاوەرۆکەی دووربکەوێتـەوە لەشار، رووبەرێکی گونجاوی هەبێتو رێگای گەیشتنی ئاسان بێت.

## چارەسەرکردن

لەشـوێنی کۆکردنـەوەی پاشمـاوە پێویسـتە چـەندین ژوور هەبێت بۆ کارمەندان، عەمبار بۆ عەمبارکردنی مەوادی کیمیاویو پاشماوە جیاکراوەکـان، گۆرەپـانو گـەراج، وێنـەی ژمـارە (٤)و (٥).

## پێشنیار:

١-دەتوانرێت سود لەم پرۆژەیە وەربگیرێت بۆ دەستکەوتنی وزەی کارەبـا هـەروەك لەهەنـدێك وڵات ئـەنجام دراوە، وەکـو دەوڵەتی کوێت، وێنەی ژمارە (٦).

٢-داپۆشـینی پاشمـاوە ئەندامییـەکان بەچـینێك لـەخۆڵو ئاماوەیـەك جـێ بهێڵرێـت، بەمـەش پـەینی کیمیـاوی دەسـت دەکەوێت.

٣-رێگا نەدرێت پاشماوەکـان بسـوتێنرێت لەشـوێنی کۆکردنـەوە تاکو هەوا پیس نەکات.

٤-ئەو کارگانەی پاشماوەکانیان مەترسی ژەهراوی لێ دەکرێت پێویستە چارەسەری سەرەتایی بۆ بکرێت ئینجا رێگا بدرێت لـەو شوێنە فڕێ بدرێت یاخود لەشوێنی تایبەتی تر فڕێ بدرێت.



وێنەی (٣) جۆرەکانی ئۆتۆمبێلی گواستنەوەی پاشماوە



وێنەی (٤) هێلکاری شوێنی کۆکردنەوەو چارەسەرکردنی پاشماوە



وێنەی (٥) داپۆشینی پاشماوە



وێنەی (٦) هێلکاری دەستکەوتنی وزەی کارەبا لە پاشماوە

## سەرچاوەکان:


1-Kiely, G. (1997) "Environmental Engineering". Mc Graw- Hill Publishing company.

2-Cairncross, S. and Feachem, R. (1993) "Environmental Health Engineering in the Topics", First edition, John wiley and Sons Ltd.

3-Directorate of Health Erbil Governorate (2002), "Annual report for year 2002", Environmental Protection branch, water contamination unit with support of WHO Erbil office.

# نێوانە دەنکۆڵەییە داخوران لە پۆڵا ژەنگ نەگرەکاندا

# Intergranular Corrosion In Stainless Steels



**ڕەمەزان گەردی**

مامۆستای یاریدەدەر لەکۆلێژی ئەندازیاری بەشی میکانیک/ زانکۆی سەلاحەددین

**سەیرکردنی پێکهاتەی پۆڵا ژەنگ نەگرەکان لەژێر میکرۆسکۆپ، بەشێوەیەکی دەنکۆڵەیی (grain) دەبینرێن. ئەم پێکهاتەیە لەژمارەیەکی بێشوماری دەنکۆڵە پێکهاتووەو هەر دەنکۆڵەیەکیش تخووبێکی (boundaug) تایبەتی خۆی هەیە لەدەنکۆڵەکانی دەورو پشتی جیای دەکاتەوە. دەنکۆڵەکان لەهەر جۆرە پۆڵایێکدا رەنگێکی تایبەتیو شێوەی جیا جیای هەیە، وەك: چۆنیەك، درێژ کۆڵە، دەرزیلەیی، بازنەیی نارێك، .. هتد، هەروەها قەوارەی دەنکۆڵەکانیش لە پۆڵایەکەوە بۆ پۆڵایەکی تر دەگۆرێت، ئەم جیاوازیانەی دەنکۆڵەکان پەیوەندی راستەوخۆی بە سیفەتە میکانیکییەکانی پۆڵاکانەوە هەیە.**

لەڕووی کیمیاییشەوە پێکهاتەی تخووبی دەنکۆڵەکان بەتەواوی جیایە لەپێکهاتەی ناوەوەی دەنکۆڵەکان، ئەم جیاوازییە کیمیاییە وا دەکات تخووبی دەنکۆڵەکان ببێتە ئەنۆدو ناوەوەی دەنکۆڵەکانیش ببێتە کاسۆد، هەر کاتێك پۆڵا ژەنگ نەگرەکان بەر ئەلیکترۆلایتێك بکەون داخورانی پۆڵاکان لەسەر تخووبی دەنکۆڵەکان ڕوو دەدات.

نێوانە دەنکۆڵەییە داخوران لەپۆڵا ژەنگ نەگرەکان سەرەڕای زیانی ئابووری؛ زۆر ترسناکە. ڕوودانی ئەم جۆرە داخورانە لەکارگەکان و وێستگەکانی بەرهەم هێنانی وزەی ئاووکی، فڕۆکەو مانگە دەستکردەکان و کەشتی ئاسمانیو موشەك، کە پۆڵا ژەنگ نەگرەکان بەڕێژەیەکی زۆر تیایاندا بەکار دەهێنرێت، دەبێتە هۆی نانەوەی کارەساتی گەورە چونکە بەشێوەیەکی کتوپڕ ڕوو دەدات مرۆڤ پێشبینی ناکات هەروەك لەسەرەتا باسکرا کردارەکە بەتەواوی لەناوەوەی پۆڵاکان ڕوو دەدات و لەژێر میکرۆسکۆپ نەبێت نابینرێت.

بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی پۆڵا ژەنگ نەگرەکان بۆ نێوان ٥٥٠س- ٨٥٠س لەئەنجامی لکاندن (Welding) یان هەر هۆیەکی تر بێت بارێکی زۆر لەبار دروست دەکات بۆ خێرا ڕوودانی نێوانە دەنکۆڵەییە داخوران.

وێنەی ژمارە (١) نێوانە دەنکۆڵەییە داخوران لەپۆڵا ژەنگ نەگری جۆری AISI316L پێشان دەدات کە بۆ ماوەی ٢٤ کاتژمێر لە ٦٠٠س ماوەتەوەو پاشان بۆ ماوەی (١٤٢) کاتژمێر لەنێوەندێکی ترشی نایتریکی کوڵاو بووە.

بەهێزترین و پشت ئەستورترین بیردۆزەی لێکدانەوەی ئەم جۆرە داخورانە بریتییە لەبیردۆزەی لەبەرچوونی کرۆم (    ) کە لەلایەن زانا (Bain) و تیمەکەی لەساڵی (١٩٣٣) دانرا. بەپێی ئەم بیردۆزە داخورانی نێوانە دەنکۆڵەییە داخورانی لەپۆڵا ژەنگ نەگرەکان لەئەنجامی نیشتنی کاربیدی کرۆم بەهۆی گەرمی لەسەر تخووبی دەنکۆڵەکان، ڕوو دەدات. نیشتنی کاربیدی کرۆم هاوکات دەبێت بەڕۆیشتنی ڕێژەیەکی بەرچاوی کرۆم لەو ناوچانەی کە دەکەونە ڕۆخی تخووبەکان بۆ کاربیدە نیشتووەکان، بەمەش دابەزینی بڕی کرۆم لەو ناوچانە بۆ ژێر ئەو بڕەی کە پێویستە بۆ دروست بوونی چینێکی تەنك و چڕو ڕەق بەدەوری پۆڵاکەدا.

ئەم بیردۆزە ڕادەوەستێتە سەر ئەم گریمانانە:

١-کەمترین ڕێژەی پێویستی کرۆم لەپۆڵا ژەنگ نەگرەکان بۆ ئەوەی چینی پاراستنی دروست بکەن بریتیە لە ١٢٪.

٢-کاربیدە نیشتووەکان نزیکەی ٩٥٪ کرۆمیان تێدایە لەکاتێکدا ڕێژەی کرۆم لەهەموو جۆرەکانی پۆڵاکاندا لەنێوان ١٧٪ تا ٢٥٪ دەبێت ئەو ڕێژە بەرزەی کرۆم لەناو کاربیدە نیشتووەکان لەدەوروپشتی کاربیدەکان و لەڕۆخی تخووبەکانەوە هاتبێت.

٣-ئەگەر لەئەنجامی لەبەر ڕۆیشتنی کرۆم لەتخووبەکان، ڕێژەی کرۆم بۆ ژێر ١٢٪ دابەزی؛ چینی پاراستن دروست نابێت و دەبێتە هۆی داخورانی پۆڵاکە.

## سەرچاوەکان:

1.F.G. Wilson, Br. Corrosion J., VOL. 6, May, PP. 100 (1971).
2.M.G, Fontana & R.W. Staehk, Advanced in Corrosion Science and Technology, Plenum press, VOL. 3, (1973)
3.A.J. Sedriks, Corrosion of Stainless Steels, John Wiley & Sons, (1979).
4.Fuad M. Khoshnaw & Ramadhan H. Gardi, Stainless Steel World, vol. 15, No 12, 2003, Netherland.

# سیستەمی هەڵگرتنی زانیاریەکان لەکۆمپیوتەردا



ئەندازیار یونس خالد خۆشناو
قوتابی ماستەر – زانکۆی سەلاحەددین

**بەرەو پێش چوونی شارستانی زیاتر خەڵکی سەرقاڵ کردووەو زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان و زۆربوونی کاروبارە کارگێڕیەکان، پێویستی زیاتر بە دروستکردنی فایل بۆ هەر زانیاریەک، بۆتە هۆی بەفیرۆچوونی کاتی زیاتر. زۆر جاریش لەنوسینگەو فەرمانگەکاندا کاتێکی زۆر بەهۆی گەڕان بەدوای فایلی ون بوو یان زانیاری ون بوودا بەفیرۆ دەچێت.**

لێکۆڵینەوەی زانستی تایبەت بەم بوارە دەری خستووە کە بێ بەکارهێنانی کۆمپیوتەر کاتی بەفیرۆچوو لەدوای گەڕان بەدوای زانیاریەکان زیاترە لەکاتی پشووداني ئەم فەرمانبەرە، یان کارکردنی بەشێوەیەکی ڕێك. ئەمەش گرفتێکی کارگێڕی گەورەیە کە تاکو ئێستا هەر ماوە لە دامو دەزگاکانی حکومەتی هەرێمدا بەتایبەتیو لە زۆر دامو دەزگای حکومەتەکانی رۆژهەڵاتدا.

گەڕان بەدوای زانیاری یان فایلێکدا بەندە بەچۆنیەتی ریزبەندکردنی زانیاریەکان دەربارەی فایلەکان یان پەرتووکەکان.. تەنها هەبوونی زانیاری راست دەربارەی ناو یان مێژووی پەرتووکێك بەس نییە بۆ دۆزینەوەی بەشێوەیەکی ئاسانو خێرا، بەڵکو دەبێت لەبنەڕەتدا ئەم زانیاریانە بەشێوەیەکی ئەندازەیی ریزبەند کرابن بۆ ئەوەی بتوانیت بەئاسانی هەر جۆرە زانیاریەکت بوێت بیدۆزیتەوە.

بەکارهێنانی کۆمپیوتەر بەشێوەیەکی ڕاست ئەم کارە ئاسان دەکات کە ئێستا زۆربەی کارە کارگێڕیەکان پێ ئەنجام دەدرێت. ئەگەر تەنها وەکو ئامێرێکی چاپکردن بەکاربێت ئەوا قازانجی تەواوی لێ ناکرێت. وەکو لەوێنەی ژمارە (١)دا دیارە لەسیستەمی کۆمپیوتەریدا بۆ هەڵگرتنی (Store) زانیاریەکان دوو بار دەگرێتەوە چۆنیەتی هەڵگرتنیان، مانا فیزیاویەکەی، واتە ئەو ئامێرەی کە زانیاری لەسەر هەڵگیراوە چۆنەو چۆن کاردەکات، بارەکەی تر لایەنە لۆجیکەکەیە، واتە زانیاریەکان چۆن ڕێکخراون، بە چ شێوەیەك دەتوانین بەناویاندا بگەڕێینو بیاندۆزینەوە، ئایا لەسەر بنەمای ناوی فایلە یان بەرواری نوسینیان یان ناوی نووسەر یان قەبارەی فایلەکان هتد..



وێنە(١)

با لەم باسەدا تیشك بخەینە سەر لایەنە فیزیاویەکە، کە باس لەچۆنیەتی نوسینەوەی زانیایەکان دەکات لەسەر ئامێرەکانی هەڵگرتنی زانیاری لەکۆمپیوتەردا.



وێنە(٢)

ئامێرەکانی هەڵگرتنی زانیاریەکان (Storage Devices):

(RAM) (Random Access Memory) لەم بەشەدا بەشێوەیەکی کاتی زانیاریەکان هەڵدەگیرێن، هەرکاتێك کۆمپیوتەرەکە بوەستێت ئەوا زانیاریەکانی ناو ئەم بەشە (RAM) دەسڕێنەوە. بەڵام لە کۆمپیوتەردا ئامێری هەڵگرتنی هەمیشەیی هەیە، کە هەموو ئەو زانیاریانەی تێیدا هەڵدەگیرێت لەداهاتوودا دەتوانین بەکاری بهێنین، ئەمەش بریتیە لە رۆڵی ئامێری هەڵگرتنی زانیاری لەکۆمپیوتەردا کە بەشێوەیەکی زۆر ئاسان دەتوانین هەر زانیاریەك بمانەوێت دووبارە بیدۆزینەوە بەکاتێکی کەم. ئامێری هەڵگرتن لەدوو بەشی فیزیایی پێك هاتووە.

١-ناوەندی هەڵگرتن (Storage Medium)، کە هەموو بەرنامەکانی کۆمپیوتەرو فایلەکانی تێدا هەڵدەگیرێت.

٢-ئەو بەشەی کە زانیاریەکان دەنووسێتەوەو دەخوێنێتەوە لەسەر ناوەندی هەڵگرتن. بۆ نمونە لەکاتی نووسیندا بەدەست ئەوا پەڕەی نوسین ناوەندی هەڵگرتنە، قەڵەمەکەش ئامێری هەڵگرتنە، یان ئامێری گۆڕینی زانیاریەکانە.

ئامێری هەڵگرتنی زانیاریەکان بەدوو شێوە دابەش دەکرێت. بەگوێرەی بیرۆکەی گەران بەناو زانیاریەکاندا، واتە راستەوخۆ یان یەك بەدوای یەك، بیرۆکەی چۆنیەتی باری فیزیاوی هەڵگرتنی زانیاریەکان لەسەر ناوەندی هەڵگرتنی زانیاریەکان، کە بواری موگناتیسی یان تیشك بەکاردێت یان هەردوکیان (Magnetic, Optical, Magneto Opteical) باوترین تەکنۆلۆژیای ئێستان بۆ پاراستنی زانیاریەکان.

بیرۆکەی چۆنیەتی نووسینەکە مانای ئەوەیە ئەم زانیاریانە بە چ شێوەیەك نوسراونەتەوە لەناوەندی هەڵگرتنی زانی اریەکاندا. کە بواری موگناتیسی یان تیشکی لەیزەر بەکار هاتووە، لەناوەندی هەڵگرتنی زانیاریەکان واتە بۆ نمونە دەتوانین بیان سڕینەوە یان بیان گۆڕین یان ناتوانین. بەڵام بیرۆکەی گەڕان ئەوا بەندە لەسەر چۆنیەتی رێکخستنی زانیاریەکانو شێوەی ناوەندی هەڵگرتنەکە، ئایا راستەوخۆ (Direct) دەگەینە هەر زانیاریەك، یان بەشێوەی یەك بەدوای یەکە (Sequential). بۆ نمونە لە (CD) بیرۆکەی راستەخۆ بەکاردێت واتە هەر شوێنێك لەسەر (CD)ەکە دەتوانرێت بخوێنرێتەوە، بەڵام لەکاسێتدا دەبێت لەسەر زانیاریەکانی پێش خۆیدا بڕوات ئینجا دەگاتە ئەو زانیاریەی کە ئێمە دەمانەوێت.

دیسك (Disk):

زۆرترین بەکارهێنانی هەیە لە ژیانی رۆژانەدا، بریتیە لەناوەندی هەڵگرتنی زانیاریەکان، شێوەیەکی بازنەیی هەیە، بەشێوەی (Track)و (Sector) دابەش کراوە. وە ئەو ئامێرەی کە زانیاریەکانی پێ دەنووسرێتەوە پێی دەڵێن (Disk Drive) کە ئامێرێکی میکاترۆنیکیەو دیسکەکە دەسوڕێنێت. پێوانی قەبارەی دیسك بەهەمان شێوەی پێوانی قەبارەی (RAM)ی کۆمپیوتەر دەبێت کە بە (Byte)، (MB)، (GB) دەپێورێت، بیرۆکەی (Magneto Opotical) بۆ هەڵگرتنی (Store) زانیاریەکان بەکاردێت.

(Magnetic Disk Storage Device) ئامێری هەڵگرتنی زانیاری لەسەر دیسك بەهۆی بواری موگناتیسی:

بریتیە لەهەڵگرتنی زانیاریەکان لەسەر دیسك لەشێوەی بارگەی کارۆموگناتیسی لەسەر ئەو ئۆکسیدە کانزاییەی کە لەسەر رووی دیسك هەیە ئەم زانیاریەش کە بەشێوەی بارگە هەیە پێی دەڵێن ( on bit (1))، ئەو شوێنەی کە بارگەی لێ نیە پێی دەڵێن (off bit (0))، یەکێك لە هەرە خەسڵەتە باشەکانی ئەم جۆرە دیسکانە ئەوەیە کە دەتوانی زانیاریەکانی سەری بگۆڕیت بەئاسانی، قەبارەی دیسکەکەش لەچەند سەد کیلۆ بایت تا چەند سەد گێگا بایت دەبێت. جۆرەکانی بریتیە لە ( Floppy Disk, Hard


وێنە(٣)



وێنە(٤)

Disk Internal, Cartridges or (Packs and Hard Cards.

(Floppy Disk) كە بریتیە لەشێوەیەكی پەپكەیی بازنەیی نەرم، قەپاغێكی پلاستیكی هەیە. پێشتر ٥,٢٥ ئینج بەكار دەهات بەڵام ئێستا ٣,٥ ئینج زۆرتر بەكاردێت چونكە بچوكترەو توندو تۆڵ ترەو ئاسان تر هەڵدەگیرێت. ( Hard Disk) ئەمیش لە چەند پلێتێكی بازنەیی رەق پێك هاتووە وەكو (Floppy) نییە كە تەنها یەك پارچەی تەنكی نەرمە، بەڵام (Hard Disk) چەند پلێتێكی تێدایە، زانیاری زۆرتر هەڵدەگرێت. كە ئەمەش چەند جۆرێكی هەیە. ( Internal Hard Disk, Hard Cards, Hard Cartrige) وەكو لەوێنەی (٣)دا دیارە.

(Internal Hard Disk) بریتیە لەیەكەیەكی ئەلیكترۆنی كە تیایدا هەردوو ناوەندی هەڵگرتنی زانیاریەكانو ئامێری نوسینو خوێندنەوەی زانیاریەكان هەڵدەگرێت، لەهەموو كۆمپیوتەرێكدا هەیە. قەبارەكەی دەگاتە چەند سەد (GB) گێگا بایتێك.

(Hard Disk Cartrige) ئەمەش ئامێرێكی هەڵگرتنی زانیاریەكانە كە ناوەندی هەڵگرتنو ئامێری نوسینو خوێندنەوە لەیەكتری جیاوازن. رێگای ئەوە دەدات زانیاری زیاتر هەڵبگیرێت لەناویدا، بەشەكەی بگۆردرێت. وەكو (Floppy) بەڵام كەمتر زانیاری لەسەر دادەنرێت لە ( Internal Hard Disk).

(Hard Card) بریتیە لەكارتێكی ئەلیكترۆنی دەتوانرێت زیاد بكرێت لەناو كۆمپیوتەردا، بەدانانی لەناو شوێنی تایبەت لەسەر (Mother Board) كارتی سەرەكی. بەكاردێت بۆ زیادكردنی قەبارەی هەڵگرتنی زانیاریەكان لەناو كۆمپیوتەردا، یان زانیاری گرنگ كە بەتەنیا لەو شوێنە دابنرێت.

( Optical Disk Storage Devices) باوترین شێوازی هەڵگرتنی زانیاریەكانەو زۆر بەكاردێت، لەم جۆرەدا تیشكی لەیزەر بەكاردێت بۆ نوسینو خوێندنەوەی زانیاریەكان لەسەر ناوەندی هەڵگرتنی زانیاریەكان، یەكێك لە جیاكاروەكانی ئەوەیە دەتوانرێت زانیاری زۆر دابنرێت بەهۆی تیشكی لەیزەرەوە، كە (CD-ROM) جۆرێكی بڵاوی (Optical Disk)ە، نزیكەی ( 700 MB) لەزانیاری لەسەری دابنرێت. هەرچەندە هەندێك كۆمپانیا (CD) وایان دروست كردووە كە (6GB) قەبارەكەیەتیو دیاری ترین تێبینی لەسەر ئەم جۆرە ئەوەیە، كە ناتوانرێت ئەو زانیاریانەی لەسەری دانراوە بگۆردرێت.

پێكهاتنی (CD-ROM) وەكو لەوێنەی (٤)دا دیاری كراوە، لەچوار توێژ (Layer) پێك هاتووە دووانی دەرەوە پلاستیكی پارێزەرن، دووانی ژوورەوە بریتین لەرووی نوسینو خوێندنەوە لەگەڵ توێژێكی ئەلەمنیۆم كە بۆ تیشك دانەوەیە. كاتێك (CD) دروست دەكرێت ئەوا تیشكی لەیزەر شوێنێك (pits) ئەسوتێنێت لەسەر توێژی نوسینو خوێندنەوە، لەكاتی بەركەوتنی تیشكەكە ئەو شوێنەی كە تیشكی بەركەوتووە پێی دەڵێن (pits off (0) bit)و ئەو شوێنەی لەنێوانیاندایە ( Lands on (1) bit) پێك دەهێنێت كە توێژێكی ئەلەمنیۆم لەژێری هەیە سەرەرای ئەو دوو توێژە پلاستیكیەی كە لەسەرەوەو ژێرەوەی دیسكەكە هەیە.

كاتێك كە زانیاری لە (Optical Disk) دەخوێندرێتەوە، ئەوا تیشكی لەیزەر بەناو توێژە پلاستیكەكەدا دەرواتو لەرووی ئەلەمنیۆمەكە هەڵدەگەرێتەوە، ئەگەر تیشكەكە بەر (Pit) بكەوێت ئەوا تیشكەكە دەچێتە ژوورەوە هەڵناگەرێتەوە بەڵام ئەگەر بەر (Lands) بكەوێت هەڵدەگەرێتەوە، بە (on bit) دادەنرێت.

وەكو لەوێنەی (٤)دا روون كراوەتەوە.

باوترینی ئەم جۆرە (CD)انە ( Compact Disk Read Only Memory) (CD-ROM) كە زۆر زانیاری لەسەری هەڵدەگیرێت،و دەیان بەرنامەو سیستەمی زانیاری لەسەر دادەنرێت. هەروەها زۆر بەئاسانی دەتوانرێت زانیاریەكانی تێدا بدۆزرێتەوە بەشێوەی راستەوخۆ، كامە زانیاریت بوێت ئەمیان دەتوانی بخوێنیتەوە. بەڵام شیاوی باسە كە لەم جۆرەدا تەنها دەتوانی زانیاریەكان بنوسیتەوە لەسەری واتە ناتوانرێت زانیاریەكان بگۆردرێت.( CD Recording) نوسینەوەی (CD) پێویستی بەبەرنامەی تایبەتو درایڤی تایبەت هەیە، بۆ نوسینەوەی زانیاریەكان


وێنە(٥)

کــــه بەرنامەکــــە پێــــی دەڵـــێن (Premastering Software).

Magneto Optical Storage (Devices) لــەم جــۆرەدا لێکــدراوی هەردوو (Optical) کــە تیشکی لــەیزەر ـەکردەهێنێت بـۆ نوسینو خوێندنــەوەی ـیـریـەکان. زانیاریــەکان بەشــێوەیەکی جیــاواز لەبیرۆکــەی پێشــوو کــە شــوێنەکە ـەتــەواوی کـاری تـێ دەکـرا هەڵدەگیرێت. بــەلام لــەم جــۆرەدا بەشــێوەی بــواری موگناتیســی کــە ڕێگــا بــدات بــەگۆڕینی ـزانیاریـەکان، بـۆ ئـەم مەبەسـتە ناوەنـدی هەڵگرتنی ئەوتۆ بەکاردێت ( Earasable Optical Disks) (EOD) کە لەچوار تویــژ پێـك هـاتووه، توێــژێکی کــانزایی (Metal Alloy) لەگــەڵ توێــژێکی ئەلـــــەمنیۆم ( Reflective Alaminium) لەگــــەڵ دوو توێـــژی پلاســتیکی پــارێزەر ( Protective Plastic) مەبەستی نوسینەوە لەسـەری، یەکەم جار تیشکی لەیزەر توێژی کـانزایی (Crystalline Alloy) گەرم دەکـات، گـــــەردە کانزایــــەکان (Crystals) دەجــــولێن، ئــــەنجا ئــــامێری نووســـین بەشێوەیەکی دیاریکراو کریستاڵەکان ڕێك دەخات. بەجۆرێك کە هێما بێت بۆ هــەموو ئەو زانیاریانەی کە لەسەری نوسراوەتەوە، بــۆ خوێندنــەوە تیشــکی لــەیزەر بــەناو پلاســتیکەکەدا دەڕواتو دەگاتــە توێــژی ئەلەمنیۆمەکــە تیشــکە دراوەکــە بــەناو گەردەکانی کانزاکە دەگەڕێتەوە کە پێشتر ڕێکخرابــوون، لەئــەنجامی نوســینەوە لەســەریان لەئەنجامــدا لەهەنــدێ شــوێن تیشــك دەگەڕێتــەوەو لەهەنــدێك شــوێنی تــریش ناگەڕێنێتــەوە. چــۆنیەتی ئــەم میکانیزمـــــە لەوێنــــــەی (٥)دا روون کراوەتەوە.

(Tape Storage Device) شریتی تۆمارکردن کە بیرۆکەی بواری موگناتیسی بۆ هەڵگرتنی زانیاریـەکان بـەکاردەهێنێت. بــۆ نوســینو خوێندنــەوەی زانیاریــەکان شــێوازی (Sequential) یــەك بــەدوای یەك بـەکار دێت کـە وەکـو کاسێت وایـە. شــــریتەکە بــــۆ (Raw)و (Column) دابـەش کـراوە هــەر وەك لەوێنــەی (٦)دا بــەڕوونی دیــارە ئــەو شــوێنەی بــواری موگناتیســی تێدایـە بـە(On bit)و ئـەو شوێنەی بێ بواری موگناتیسیە بە( Off bit) هێما دەکرێت. بە چڕی هـەلگرتنی زانیاریـەکان دەڵـێن چڕی شریتەکە، ئـەم جۆرە ئێستا بەکارنایەت، هەروەها زانیاری کەمی لەسەر دادەنرێت.

جۆرەکـانی ئـامێرو ناوەنـدی هــەلگرتنی زانیاریەکان بەردەوام لەگۆڕانـدان جگـە لـە (CD) ئــــەوا (Flash Memory) دروست کراوە، بەلام تاکو ئێستاش گرفتی نرخی هەیە کە گرانـە، بریتیـە لەشـێوەیەکی تایبــەتی کــارتێکی بچـــوك کـــراوەی ئــەلیکترۆنی کــە لــە (RAM) دەچـــێت لەقــەبارەو ناوەڕۆکـدا بەشــێوەی (Chip) هەیـــــە، بــــەلام زانیاریــــەکانی نــاوی ناســـڕێتەوە پــاش کوژاندنــەوەی کۆمپیوتــەر، لــەداهاتوودا پســپۆرانی ئــەم بــوارە مەزنــدەی ئــەوە دەکــەن کــە زۆر هــــەرزان بێـــتو زۆر بــــەکاربێت، جیگــــای دیســــکەکانی تــــر بگرێتەوە.




وێنه(٦)

(Holographic Storage) هۆلۆگرام چیە ئایا تەنها ئەو وێنەیە کە دەسووڕێت بەگۆشەی جیاواز بۆ گرتنی چەند وێنەیەك بەچەند گۆشەیەکی جیاواز؟ یان هۆلۆگرام هەرسیێ دووری بـەکاردەهێنێت بـۆ گرتنــی چــەند وێنەیــەك بــۆ تــەنێك لەچــەند رووتــەختێکی جیــاوازداو بەهــەمان شـێوە زانیاریەکان لەگەردەکاندا هەڵدەگیرێت بە بەکارهێنانی هەرسێ دووری.

ئەم میکانیزمە شێوازێکی ئالۆزی هەیە کـە هــــەم ئەلیکترۆنیــــەو کارەباییــــەو هــــەم میکانیکیشــــە، بــــەلام وردەکاریەکــــەی لەرادەبــەکی زۆرە کــە گــەلێك زانیــاری دەتوانرێـــت لەرووبــــەرێکی زۆر بچــــوك هەڵبگیرێت، بەشێوەی (bit, On, Off) کــە دەرەنجــامی پێشــکەوتنی زانســتی ســــەدەی بیســــتەمە. سیســــتەمێکی ئەلیکترۆنیــــە کــــە پێشــــکەوتوو تــــرە لــەجۆرەکانی تــری ناوەنــدی هــەلگرتنی زانیاریــەکان لەهــەمان کاتــدا دەتوانرێــت زانیاری لەسەر هەڵبگیرێتو بخوێندرێتەوە. لــەم جــۆرە ناوەنــدەدا هەرســـێ دووری بەکاردێت، لەکاتێکدا کە لە دیسکەکانی تر تــەنها دوو دووری بــەکاردێت. بــەلام لــە هۆلۆگرام قـولێش بـە هێنـد وەردەگیرێت، بۆیە بڕی زانیاریـەکان لـە هـەر یەکەیـەکی ڕووبەردا زۆر زیاد دەکات، شیاوی باسە کە قوڵیەکەشــی لــە قــووڵی کارتێــك تێپــەڕ ناکات.

لەکۆتاییــدا هیــوادارین کــە لەکوردســتانی خۆشماندا بتوانین سیستــەمی زانیاریـەکان (Data Base) کە لەسەر کۆمپیوتەر کار دەکــات لــە هــــەموو دامــو دەزگاکــانی حکومــەت بــەکار بێــت هەرچــەندە ئێسـتا بەشــێوەیەکی ســادە لەهەنــدێ شــوێن بــەکاردێت بــۆ ئــەوەی لــە کــارە رۆتینیــە زۆرەکــانی رۆژانــە ڕزگامــان بێــت کــە زۆر کــاتی فەرمانبــەرانو هاوولاتیــان بــەفیڕۆ دەدات لەفەرمانگەکانـدا. دەرکـەوتووە کـە لەولاتانی پێشکەوتوودا چەندە کارەکانیان ئاســــان بــــووە بــــەهۆی بــــەکارهێنانی سیســتەمی زانیاریــەکان (Data Base) بەشێوەیەکی دروست.

**سەرچاوە.**

**Information Technology P (132-144) by Stephen Haag & Peter Keen.**

# بواری پرۆژەکانی بیناسازی



ئەندازیاری راوێژکار:
سەردار ئەحمەد عەللاف

**جۆرەکانی بیناسازی وەکوو خانوو- قوتابخانە- نەخۆشخانە- کارگەی خشت- فرۆکەخانە- وێستگەی شەمەندەفەر- پرۆژەی ئاودێری و کارکردن لەم پرۆژانە هەر یەکە گرنگی تایبەتی خۆی هەیەو پلانی بۆ دادەنرێ.**

بۆ دەست پێ کردن بە برگەکانی پرۆژەکە لەخوارەوە هەندێك خاڵی گرنگ روون کراونەتەوە:

## ١-پلانی پرۆژە

پێش دەست بەکاربوون دەبێ هەموو نەخشەکان لەبەردەستدا بن و دیار کرابن، بەرزی پرۆژەکە لەگەڵ هەر شەقام یان بینایەکی نزیك و بکرێتە BM تا پرۆژەکە بەرێکی بکرێت،بەلام لەهەندێك پرۆژە BM زۆر گرنگە دەبێ بپارێزرێت تا پرۆژەکە تەواو دەبێت وەکو پرۆژەی ئاودێری، فرۆکەخانە، کارگەی خشت، وێستگەی شەمەندەفەر چونکە گۆرەپانی پرۆژەکە زۆرەو چەندان کیلۆمەترەو دەبێ BM راستەقینە بێت لەسەر رووی دەریا تا دەرچوونی ئاوی باران تێك بکاتەوەو دانانی BM دەبێ بەقووڵی زیاتر لەیەك مەتر بێت لەژێر خاك بچەسپێت و ئاستەکەی لەدەرەوە بێت و بۆری لەدەوری بێت تا ئاوی نەگاتە ژێرو جووڵانەوەی نەبێت.

پلان کردنی پرۆژەکە دەبێ بەئامێری پیودولایت بێت و $C_L$ دەبێ لەدەرەوەی بێت تا پرۆژەکە بەرێکی بێتە سەر زەوی و لەسەرەتاوە هەڵکەندنی بناغەکە دەبێ جهازی لیڤلی بۆ بەکار بهێنرێت بۆ کێشانە (وەزن) کردنی تاکۆنکریتی بناغە یەك بەرزی بێت. وێنەی (١)

## ٢-بەکارهێنانی کلۆریدین

کلۆریدین بەکاردێت بۆ دوورخستنەوەی مۆرانە. لەدەوری بناغە دەکرێت وەکو مۆرکداری (مواصفاتی) کۆمپانیای ئامادەکەری.

## ٣-ئامادەکردنی شیش لەبناغەدا

شیش لەبناغەدا بەگوێرەی نەخشەی دانراو بەیەك چین یان دوو چین دەبەسترێ و لەبناغەی باڵەخانەی بەرز وەکو (Raft) ئەبێ زۆر بەگرنگی کرسی بەینی هەردوو چینەکە شیش دابنرێ و بەهێز بێت تاگرانی و جووڵانەوەی کرێکاران لەسەری رابگرێت.

## ٤-دانانی Water stop

بەکاردێت بۆ نێوان دیوارەکانی نهۆمی زەمینی لەگەڵ داڕشتنی بنچینەدا (صبی اساس) و بەکاردێت لەدیوارەکانی مەلەوانگەو ماددەی WS بریتییە لەپلاستیك و ئەگەر هەر نەبوو پلێتی گەلڤەنەکراو (مغلون) بەکار دێت.

WS هەیە بەکار دێت لە Expansion joint. (وێنەی (٢) و (٣)).

## ٥-قیرکردنی دیوارەکان بۆ نەرۆیشتنی ئاو

دەرەوەی دیوارەکانی ژێرزەمینی کە لەبلوك دروست کراون قیر دەکرێت، لەنێوان دیواری کۆنکریت ٢سم بۆشایی دەبێ و بەقیر پڕ دەکرێتەوەو دەبێ کەم کەم بینا بکرێت. ئێستا هەندێ قیری تازە هەیە لەبازاڕ وەکو لباد لەدیواری کۆنکریتی دەدرێت.

بۆ ئاگاداری ئەم کارە قیری (سیالی) نابێ بەکاربێت چونکە لەرێگای بچووکترین دەرز دێتە ژوورەوە.

## ٦-ئاوی ناو نهۆمی ژێرزەمین

هەندێك باڵەخانە ئاوی بارانی دێتە ژوورەوە لەرێگای رەمپە یان شوشتنی ژوورەکانی خوارەوە لەم حاڵەتەدا دەبێ حەوزی بۆ بکرێت و پەمپی ژێراو (مزەخەی غاگس)ی بۆ دابنرێت بەئوتوماتیك کاربکات. ئەم حاڵەتە بۆ ژووری ئامێری سارد کردنەوەی باڵەخانە پێویستە.

## ٧-پشکنینی ماددەکان

ێشت ماددەکان دەبێ تاقی بکرێنەوە
ـەگ، قوم، چیمەنتۆ، شیش، بلۆك،
ـی، خشت.. هتد.

ـەموو گرنگتر دەبێ شەشپالوو
ـکعب)ی کۆنکریتی لەلایەن ئەندازیاری
ـۆژە وەربگیرێت لەبەر ئەوە ئەندازیار
ـەرسیارە لەشکست هێنانی شەشپالوو
ـکعب) چونکە تێکەڵەی ماددەکان باش
ـێت دەبێ رابگیرێت، نەك بکرێتە ناو
ـەشپالوو (مکعب).

## ٨-قالبی تەختەبەند (نجاری)

یەکەم جار بە (جهاز لیڤل) بەرزی
ـەکە نیشان دەکرێتو دەست دەکرێت
ـە بن پردە (جسرە)کانو دەبێ (فرسو
ـیر) بەکاربێت نەك کەپرەو ئاگاداری
ـەرزی کۆڵەگە دەبن لەکاتی دارشتنی
صب کردنی) نەك بەرزتر بێت لەژێر
جسرەکان.

دەرسەکەکان دەبێ شاقولی بێتو نابێ
حواربێتو پێش دەست پێکردن بە(صب)
ـەماشای دەرسەك بکرێت نەوەك
جوولابێتو بنی بۆش بێتو لەکاتی (صب
کردن) وەستا دەبێ ئاگاداری بنی قالب
بێت نەوەك لە جوولانەوەی ناوشێل
(خەباتە)و عەرەبانە دەرسەك جوولە بکا.

لەبابەت دنگە لەنهۆمەکانی سەرەوە
دەبێ شاقول بکرێت لەگەڵ نهۆمەکانی
خوارەوە بە بەرزی باڵەخانەکە.

## ٩-شیش بەستان

دەبێ یەکەم جار شیشو ئەلقەکان
ئامادەبکرێن لەگەڵ ئامادەکردنی (قالبی
نەجاری)و مادەکان، دەبێ خشتەی برینی
شیشیان بۆ کرابێو بەتەواو بوونی قالبە
کە شیشەکە دەبەسترێو جسرەکان
دادەبەزێ کاری بۆری، کارەبا تەواو دەبێ
ئینجا شیشی سەقفەکان دەبەسترێ.و
دەبێ ئاگاداری دانانی کەڤەر بن لەبن
شیشی پردو (سەقفە) بانەکان.

## ١٠-کۆنکریت کردن



وێنەی(١)



وێنەی(٢)


وێنەی(٣)

ئامادەکردنی دارشتە (صب) دەبێ
ناوشێل (خەباتە) ئامادە بێت بەقەدەر
پێویست لە ٢ تا ١٠م٣ بەماوەیەکی کەم
کۆنکریت تاوتو بکرێتو مەوادەکان
ئامادەبن چەگل، قوم، چیمەنتۆ، ئاوو
ئامێری ڤابریترو نیشانەی لیڤل بکرێت بۆ
بەرزی کۆنکریت، دەبێ ئاگاداری سەر
کۆڵەگەکان بن لەبەر ئەوەی لەچوار لاوە
شیشی دێتە سەرو زۆر بەزەحمەت پڕ
دەکرێت.

## ١١-تەواوکردن Finishing

گرنگترین کارە چونکە هەموو کارەکانی
تر دادەپۆشیێو بەرچاو دەبێ:
(دەرگا دانان) دەبێ بەرزی کۆنکریتی
سەر دەرگاکان هەموو بەلیڤل کرابێو
لەژێرەوە حسابی بەرزی کاشی کرابێ تا
لەبەرزی دەرگاکە کەم نەبێ.

(کاشی موزائیك)، پێش دانانی کاشی
دەبێ لیڤل کرابێو نیشانەی بۆ دانرابێت
تاکارەکە هەمووی یەك بەرزی بێت.
(کاشیو دیوارەکان)، دەبێ یەکەم چین
لیڤل کرابێو هەر چینی دوایی ئاگاداربن.
(سپی کاری)، بە راستەپێوەر (مسگار)
بکرێتو گۆشەی وەستاو (زاویەی قائم)
بێتو جۆری مادەکە باش بێت.

## ١٢-پەیژەی بەینی نهۆمەکان

لەسەرەکی گرنگی بدرێت بەقالبی
نەجاری پەیژەو لەنهۆمی زەوی حسابی بۆ
بکرێت لەبەر ئەوەی وا روودەدات یەکەم
پەیژە زۆر بەرز دەبێو لەسەرەوە کەم
دەبێت، بۆ ئاسان کردن لەکاری پەیژە
بەکاشی یان مەرمەڕ بەینی دوو نهۆم
حساب بکرێتو دابەش بکرێت لەسەر
ژمارەی پەیژەکانو لەدیواری تەنیشتەوە
پەیژە پەیژە نیشانە بکرێت تاکو هەڵە
روونەدەدات. ئەگەر دیوار نەبێت دەبێت
دوورایییەکانی پەیژە بەدار دروست بکرێن
لەسەر ئەو شێوانە نیشانەی بۆ دابین
بکرێت.

## ١٣-ئاوو ئاوەڕۆ

گرنگترین برگەی پرۆژەی باڵەخانە ئاوو
ئاوەڕۆیە بۆ ژێر ئاودەستو گەرماوو
هەندێك جار بن ئاودەست بنمیچی
(سەقفی) دووەمی دادەبەزێت بۆ جێ
کردنی بۆری ئاوەڕۆو هەندێك جار ئاوەڕۆ
لەبن بنمیچ (سەقف) دەبێتو دادەپۆشرێ
بە بنمیچی لاوەکی (سانەوی)و لەهەردوو
حاڵەت دەبێ زەوی گەرماوو ئاودەست قیر
بکرێن بەقیرو بۆریەکانی ئاوی خاوێن
دەبێ باش بێتو پێش داپۆشینی
ئەزموون بکرێت.

بۆریەکانی ئاوەڕۆ ئاهین یان پلاستیك
دەبێت جۆری باشو پشکنین (فحص)
بکرێت. لەباڵەخانەی گەورە وەك
میوانخانە کە ژووری زۆرە دوو هێڵی ئاوی
گەرم بەکاردێت تا ئاو بەهۆی پەمپی
(مزەخە)ی لای بۆیلەر بسورێتەوە،
لەژوورەکان بەبەردەوامی ئاوی گەرم نزیك
دەبێت.



ئەندازیار:
فەرهاد عوسمان حەمەک

# کارگێڕی و وەرگرتنی پرۆژەکانی بیناسازی

**پێشەکی:-**

ئاشکرایە وەزارەتی ئاوەدانکردنەوەو گەشەپێدانو بەڕێوەبەرایەتی ئاوەدانکردنەوەو گەشەپێدانی هەولێر لەسالآنی رابردوو بێجگە لەپرۆژەکانی ڕێگاوبان چەندەها پرۆژەی بیناسازی ئەنجامداوە، وەك قوتابخانەو بنکەی تەندروستیو دروستکردنی سەدان خانوو بۆ شەهیدانو بینایەی گەورەی وەك بینایەی بانکی هەرێمو یاریگای بلیۆ سەلاحەددینو قایمقامیەتی مێرگەسۆر. هەروەها چەندین پرۆژەی چاکردنەوەی قوتابخانەو بینایەکانو زۆربەی زۆری پرۆژەکان لەڕێگای راستەوخۆو هەندێك لەڕێگای بەلێندەرەوە ئەنجام دراون، زۆربەیان بەڕێکی ئەنجام دراون، بەلآم هەندێکیان کەمو کورتی هەبووە. ئاشکرایە دوای رزگاربوونی کوردستان بەتەواویو هاتنی سوپای ئەمریکا ئێستاکە چەندەها پرۆژەی گەورە لەبەرنامە دایە، بۆ ئەوەی بتوانرێت ئەم پرۆژانە هەمووی ئەنجام بدرێت دەبێت بەڕێگای بەلێندەرەوە بێت. بۆ ئەوەی ئەم کەمو کورتیانە کە پێشتر روویداوە روونەداتەوە، پێویستە خۆ ئامادە بکرێت بەکۆکردنەوەی هەموو زانیاریەك دەربارەی ئەو ئەگەرە.

ئەو مەرجانەی لەسەر بەلێندەرن:

**بەلێندەر دەبێت پابەند بێت بەم خالآنەی خوارەوە:**

١-نۆرینی تایبەت بەکارەکەی کە ئیمزای هەردوو لایەنی لەسەر کراوە.

٢-هەموو ئەم نەخشانەی کە پەیوەندی بەپرۆژەکە هەیە.

٣-دەبێت بەهەموو ئەم خالآنەی کە لە تایبەتمەندیی تەکنیکی گشتیی عێراقی (IGST) (مواصفات الفنیە العامە العراقیە) هەیە رازی بێت.

**تایبەتمەندی تەکنیکی گشتیی عێراقی (IGST):**

١-پێویستە بەلێندەر هەموو ئامێرو پێداویستی ئامادە بکات وەك (لیڤلو ثیودۆلایتو.. هتد).

٢-فەرمانگەیەك دروست بکات بۆ ئەندازیار لەشوێنی پرۆژەکە.

٣-ئوو کارەبا بگەیەنێت بۆ شوێنەکە (موقع)و ڕێگای خۆش بکات.

٤-هەموو کەل‌و پەلی پێویست لەشوێنەکەدا لەکۆگا دابنرێت.

٥-سەرەسمی دەبێت شوێنی (موقعی) پڕۆژەکە بدرێت بە بەڵێندەر بۆ ئەوەی دەست بکات بە پلاندانان (تخطیط) کردن‌و ڕۆژی دەست پێکردن دەبێت جێگیر بکرێت.

٦-لەشوێنەکەدا (موقع) دەبێت تۆماری ڕووداوەکان (وقائع) هەبێت بۆ دەست نیشان کردنی چالاکی بەڵێندەرو ڕۆژەکانی کار وەستان‌و تێبینی ئەندازیار لەسەر کارەکاندا.

٧-بەڵێندەر بۆ هەر بڕگەیەك کە تەواوی دەکات دەبێت ڕەزامەندی ئەندازیار وەربگیرێت بۆ ئەوەی بڕگەی دوای ئەوە جێبەجێ بکات، بەڵێندەر بۆی نییە دەست بکات بەهەڵکەندن تاوەکو ڕەزامەندی وەرنەگرێت لەسەر نەخشەو پلانەکە.

٨-دەبێت خاڵی نیشانە (B.M) دابنرێت لەگەڵ ڕووپێو (مسح) کردنی شوێنی (موقعی) پڕۆژەکەو جێگیر بکرێت.

٩-هەموو ئەو مەوادانەی کە زیاد دەبێت بگوازرێتەوە بۆ جێگەیێکی دوور لەو شوێنە (موقع).

١٠-لەکاتی هەڵکەندن ئەگەر بینرا خۆڵەکە زۆر خراپە دەبێت ئاگاداری نەخشەکێش بکرێتەوە بۆ بەدواداچوونەوەی نەخشەی بناغەکە لەبەر ئەوەی دەرزی زۆر گەورە لەدیوارەکان دروست دەبێت هەروەك لەهەندێك قوتابخانەی قەلاسنج‌و میراوە ڕوویدا.

١١-ئەگەر لەشوێنی پڕۆژەکە ئاو هەبوو دەبێت چارەسەر بکرێت‌و لەبناغەی بیناکە دووربخرێتەوە.

١٢-هەموو ئەو کەل‌و پەلەی کە دێتە شوێنەکە (موقع) دەبێت بپشکنرێت ئینجا وەربگیرێت.



## وەرگرتنی پڕۆژەکان

ئەندامانی لێژنەی وەرگرتنی پڕۆژەکان پێش ئەوەی سەردانی پڕۆژەکە بکەن کە ئەنجام دراوە لەهەموو نەخشەکانی پڕۆژەکە دەکۆڵنەوە کە لەگەڵ نۆرینی تایبەت بەپڕۆژەکە دوای سەردانی پڕۆژەکە دەکەن بۆ مەبەستی وەرگرتنی پڕۆژەکە ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕەچاو دەکرێت.

١-نابێت درز لەدیوارەکاندا هەبێت، بەتایبەتی درزی بەهۆی دابەزینی بناغەی بیناکە، ئەو جۆرە بینایەیە وەرناگیرێت (استلام ناکرێت) کە ئەم جۆرە درزەی هەبێت، ئەگەر درزی ورد هەبوو دەبێت چارەسەر بکرێت بۆ وەرگرتنی لەکۆتایی دووبارە سەیری ئەم شوێنانە دەکرێتەوە کە درزی تێدا هەبوو بێت.

٢-نابێت شێ هەبێت لەدیوارەکاندا یان بن میچی بینایەو ئەگەر هەبێت پێویستە چارەسەر بکرێت‌و ئەگەر زۆر بێت وەرناگیرێت.

٣-جۆری ئەو کەل‌و پەلانەی کە بەکار هاتووەو بەراوورد کردنی لەگەڵ دەرخستە وەك دەرگاو پەنجەرەو پانکەو سویچ پلاك.. هتد.

٤-جۆری ئەنجام دانی بڕگەکان دەبێت باش بێت وەك (لەبغ‌و سپی کاری‌و کاشی زەوی‌و.. هتد).

٥-پشکنینی تۆڕی ئاوو ئاوەڕۆی بیناکە.

٦-پشکنینی تۆڕی کارەباو ساردکردنەوە (ئەگەر هەبێت) لەبیناکەدا.



# تەکنۆلۆژیای بۆشایی و دۆزینەوەی ئاوی ژێرزەوی لە بیابانەکاندا



ئەندازیاری راوێژکار/ هەژار خالید

**تەکنەلۆژیای بۆشایی لە پەرەپێدانی گۆی زەوی رۆڵی کاریگەرو خاوەن داهاتی هەبوو لە چەند دەیەی سەدەی بیستەمداو لەسەدەی بیست و یەکدا روو لە زێدەبووندایە. هەوڵی دۆزینەوەی ئاو لەسەر هەسارەی بارام ( مارس: مەریخ ) لەرێگای راداری لەسەر پێکاری دەسکردەوە هەڵگراوی کە لە دەورەی مەریخدا دەخولێنەوە گەیشتە ئەو ئاکامەی لەوە دڵنیابن کەوا ئەم هەسارەیە لە ملیۆنان ساڵی ئاوی لەسەر بووەو لافاوی هاوشێوەی وشکە دۆڵەکانی بیابانی سەر رووی زەوین. زانایان لە ئاژانسی ناسا لەو باوەڕەدان ئێستا لەسەر رووی ئەم هەسارەیە ئاو لەشێوەی بەفری شاردراوە لەژێر چینە لمێکی ئەستووری چەندان مەتریدا هەیەو لە شوێنێك بۆ شوێنێکی دیکە جیاوازە.**

ئەم رادارە دەتوانێت وێنەی ئەو شتەی لەژێر لیمەوەیە بە قووڵی چەند مەترێك وێنەبگرێت. ئەم وێنانە لەو کاتە دەگرێت کە بەدەوری هەسارەکە دەخولێتەوە.

بەهەمان تەکنەلۆژیا زانایانی جیۆلۆژیای بۆشایی هەوڵیان داوە ئاوی ژێر بیابانەکان لەسەر زەوی بدۆزنەوە، ئەویش لەرێگای بەکارهێنانی راداری لەسەر پێکاری دروستکراو هەڵگیراوی کەلە دەورەی زەویدا دەخولێتەوە. سوود لەم تەکنەلۆژیایە وەرگیرا لە دۆزینەوەی ئاوی ژێر زەوی بیابانی عەرەبی لە بیابانی گەورەی باکووری ئەفریقیا وەك ئەزموون لەناوچەی خوارووی بیابانی رۆژئاوای میسرو ناوچەی چەمەکان (واحات) لەرێگا رادارەوە بوونی رووباری کۆنە لەو ناوچانە دۆزراوەتەوە لە چاخە بەبارانەکان، بەلام بەلیم داپۆشراون. ئەم رووبارانەی بەپێکاری دەستکرد هەڵگیراو دۆزراوەتەوەو پێشیان دەوترێت Radar Rivers . بەهەمان شێوە لەناوچەی کەفرەی خوارووی بیابانی لیبیا لەرێگا رووماڵی راداری بوونی رووباری کۆن لەو ناوچانە دۆزراونەتەوەز هەر لە رێگای ئەم تەکنەلۆژیای پێشکەوتووەی بۆشایی ئاسمان توانراوە دێلتای کۆنی دۆڵی نیلی دیاربکرێت کە بنکەکەی لە فەیوم تا ئیسماعیلیەی ئێستا بووەو دێلتای ئێستا بەشێك بووە لە بنی دەریای سپی ناوەڕاست هەتا بیابانەکانی نیوەدوورگەی عەرەبیشی لەرێگای ئەم رادارە هەڵگیراوە دۆڵی وشك و رووباری کۆنی تیادا دۆزراوەتەوە کە لەژێر لیم داپۆشراون لە خواروو و باکووری دوورگەدا. هەروەها ناوچەی روبعی خالی لەشانشینی سعودی رووماڵکراوە. هەروەها بیابانی



ســەڵتەنەتی عومــان و رووبــارە کۆنــەکان بــەوردی دیــاریکراون و تەلاتێکی کۆن لەو ناوچەیە دۆزراوەتەوە لەرێگای راداری زەمینی GeoRadar کە دەشــێ شــاری (اِرَم ذات العماد التي لم يخلق مثلها في البلاد) واتە شاری (ئیرەم) بێت لە قورئانی پیرۆزدا نــاوی هاتووە کــە ئامــاژە بــە شارســتانیەتی ئــەوان دەکــات و کۆشــك و تــەلارو بــاخ و باخاتیــان و خۆشــگوزەرانیان بــاس دەکــات پــێش گــۆڕانی ئــاوو هــەوا لــەو ناوچــە بیابانــە وشــکەدا کــە تیایــدا بــا دەلوورێنێت.

زۆر لە دەوڵەتانی عەرەبی ئەوانەی کەمی ئاویــان هەیــە ئــەم تەکنــەلۆژیای بۆشــاییە پێشــکەوتووەی راداری هــەڵگیراو لەگــەڵ پێوەرانی موگناتیسی بەدەزگای Coil Magneticو پێوەرانی کارەبــایی بــەدەزگای Electromagnetic بــەکاردێنن بــۆ دۆزینەوەی سامانی ئاوی ژێر زەوی و ژێر رووخــان و دیــاریکردنی رادەی ئەم ئاوەو رادەی ئــاو دەردان و درزەی ئــاو لــەنێو بەردانــدا لــەو چینانەی هــەڵگری ئــاون ئەوەشــیان بــۆ پــەرەدان بەناوچــە بیابانــەکان و چــاندنیان لــەرێگای پــرۆژەی گــەورەی وەك زێــی دەسکردی گەورە لەلیبیا پرۆژەی خــواروی دۆڵــی (توشــکی) لــە میســرو پــرۆژە پەرەپێدانــەکانی دی لــە دەوڵــەتانی کەنــداوی عەرەبی.

ئێســتا پێکــارێکی دەســکرد دروســت دەکرێــت بەهاوبــەش لەگەڵ ئاژانسی ناساو بنکەی ئەڵمانی بۆ فڕین و بۆشایی ئاسمــان DLR ناسراو بــە Experiment GRACE (Gravity Recovery and Climate) ئــەرکی ئــەم پێکــارە لێکۆڵینەوەیە لە گۆرانکارییەکانی کەوا لــە کێشــی زەوی دا هەیــە لەئاکامی گۆڕانی کەش و هەواو ئاوی ســەر رووی زەوی ژێــرزەوی هەندێ ناوچەی گۆی زەوی. ناوچــەی بیابــانی خــواروو رۆژئــاوای میسر (ناوچەی رۆژهــەلاتی عوینــات) وەك ناوچــەیەکی نموونــەیی هەڵبژێردرا بۆ ئەنجامدانی ئەزموونەکان بەهۆی ئەم پێکارە نوێیــە لەرێگای هاوکاری زانستی میسری – ئەمریکی زانایانی میســری و ئەمــەریکی تایبەتمەنــد لــە زانســتەکانی میتیولوجیــا (کــەش)و هیدرولوجیا (ئاو). ئەزموونەکە بەسەرکەوتوویی سەرکەوت.

**ئامادەکارییەکان:**

نێردەیــەکی زانســتی میســری – ئــەمریکی پێکهــات بــەم شــێوەی خوارەوە:

١- پێوانی فشاری هەوا بەسێ بارو مەتری نوێ لە ناوچەی رۆژهەلاتی عوینات و بەهەستیاری و لەماوەی جیاجیا.

٢- کۆکردنەوەی ئاکامی روانگەی کەشناسی ئەو ناوچــەیەو ناوچەکانی دەوروبەری لەماوە چەندان ساڵی دوایی.

٣- کۆکردنــەوە پێوانــەکانی گــۆڕانی مانگانــەی ئــاوی ناوچەکە، خوناو، ئاستی بیری ئاوو رادەی شێی خاك.

٤- کۆکردنەوەی روانگــە ســەبارەت بــەلافاوی ئــاوی نیــل و رادەی گۆڕانی ئاوی دەریای ئاسر.

٥- کۆکردنەوەی روانگە لەبارەی بەرزاوو نزماو لــە کــەناری دەریای سپی و دەریای سوور.

پــرۆژە پێکــاری دەســکردی GRACE داهــاتێکی زۆری هەیــە لەســەر ئاســتی جیهــان بەگشــتی و بیابــانی وڵاتــانی عــەرەبی بەتایبــەتی ســەبارەت بــە لێکۆڵینــەوە لــەئاوی بیابانــەکان و دامەزراندنی کێڵگەو چالاکی پیشەسازی و ئاوەدانی لەبیاباندا.

لەبەرئــەوەی ئــەم ناوچــانە دوورن لەسەرچــاوەی وزەی کارەبــاو دوورن لــە تــۆڕی نەتــەوەیی کارەبا بۆیــە ســوود لــە سەرچــاوەی دیکەوە وەرگیراوە، وەك وزەی خۆر، لەهەندێ شوێندا دەکاتە دوو هەزارو پێــنج ســەد کیلــۆوات/ کاتــژمێر لەســەر یــەك مــەتر دووجــا لەساڵێکداو دەشێ زیاتریش بێت.

لەبەرئەوە بەکارهێنانی خانەی خۆرەکی بەللووری و نابەللووری و کۆکراوە لە دەپی کارۆهەتاوی ئــامرازی گــۆڕینی وزەی خــۆرە بــۆ وزەی کارەبــایی بــۆ پرۆژەکــانی ئــاودێری و پەرەپێــدانی ناوچــە بیابانیە دوورەکان. ئەوەش لەبیرنەکەین کەوا خانــە هەتاوییــەکان و دەپەکانی کارۆهەتاویی بەرهــەمی تەکنــەلۆژیای بۆشــایین کەلــە کۆتایی پەنجاکانی سەدەی رابردوو بەهۆی پێویســتی دەزگاکــانی پێکــارە دەســکردەکان بــۆ وزە لــە بۆشــایی دەرەوە داهێنــرا، سەرەتا نرخی ئــەم تەکنەلۆژیایــە زۆر گــران بــوو نرخــی انەیــەکی هەتاوی کە یەك وات کارەبــای دەدا بەچــل دۆلار بــوو دواتــر رووی لەکزی کرد لە کۆتایی سەدەی بیستــەم گەیشــتە کــەمتر لــە چــوار دۆلار ئەوەش رێــی خۆشــکرد بــۆ بــەکارهێنانی لکاری ســەرزەوی وەك نــاردنی ئــاو بــۆ ناوچــە دوورەکــان و بەتایبــەتی بیابانــەکانی وزەی خۆری لێ والآیە.

**بــەم شــێوەیە تەکنــەلۆژیای بۆشــایی ئاسمــان کــە زۆر دەنگــی نارەزایی هەبوو لەبەر تێچووی پرۆژەکانی، بەڵام داهاتی ئابووری گەورەی هەیە لەزۆر بوارەکانی سەرزەوی بەتایبەتی لە پەرەدان بەبیابان و دۆزینەوەی سامانی کانزایی و پترۆل و ئەمباری ئــاوی ژێرزەوی.**

# پشکنینی خشتەکەکانی کۆنکرێت

# Concrete cubes test



ئەندازیار/ ئاگرین عەبدوللا عەزیز

**سەدەی بیستەم بەسەردەمێکی زێرینی بواری بیناسازی دادەنرێت، چونکە سەردەمی دۆزینەوەی کۆنکرێت بووە ، ئیتر لەوکاتەوە زانستی ئەندازیاری بیناسازی گۆڕانێکی جۆرەکی فراوانی بەخۆیەوە بینی ، ئەگەر جاران هەر چەند سەدەیەک و هەندێک تازەگەری و داهێنانی تیادا روودەدا ، ئەوا سەدەی بیستەم بە هاتنە کایەی کۆنکرێتەوە جۆرەها داهێنان و شێوازی بیناسازی هاتە کایەوە کە مرۆڤی سەرسام کرد.**

کۆنکرێت بەهۆی سیفەتەکانی: هەرزان و خێرایی لە کارپێکردن و دەستکەوتنی بە رێژەی زۆر ، ئاسانی بۆ پێکهێنانی هەر شێوەیەکی ئەندازیاری لە بینادا ، درێژی تەمەنی بۆ بەرگری کردن لە هۆکارەکانی کەش و هەوا . بوو بە ماددەیەکی بێهاوتا لە بواری ئەندازیاری شارستانی لە سەدەی رابردوودا و تاکو ئێستاش ..... لە پاڵ هەموو ئەمانەشدا رۆڵی گرنگی بینی لە گەشەپێکردنی شارستانیەتی مرۆڤایەتیدا.

گەرچی کۆنکرێت خۆی لە خۆیدا زانستێکی گەورە و فراوانە و چونە ناو دنیای ئەوەوە مانای گەشتێکی دوور و درێژە و دەرفەت و پانتاییەکی زۆری گەرەکە تاکو پەی بە هەموو چمك و پێچ و پەناکانی ببەین . منیش لە ژمارەی (١)ی گۆڤاری ئەندازیاری هاوینی ٢٠٠١دا ، بابەتێکم لەسەر دیاردە کاریگەرەکانی سەر کۆنکرێت بڵاوکردەوە ، لێرەشدا بە سوود وەرگرتن لە چەند سەرچاوەیەك کە لەدوایی نوسراوەکەدا دیاریم کردووە بە پێویستی دەزانم تیشك بخەمە سەر لایەنێکی تری.

بۆ ئەوەی کۆنکرێت بە شێوەیەکی دروست و بەپێی رێنماییە ئەندازیاریەکان جێبەجێبکرێت ئەوا چەند پرۆسەیەك و هەنگاوێك هەیە، پێویستیەکی بنەرەتین و دەبێت پەیڕەوبکرێن، لە ناویشیاندا وەرگرتنی پشکنینی خشتەکەکانی کە بەهۆیەوە بەرگری بۆ پاڵەپەستۆی هێز ((Compression Strength)) دەپێورێت ، بەوەش لە توانای کۆنکرێت دڵنیا دەبین کە زیاترە لە کەمترین بڕی دیاریکراو ، تاکو بێ ترس لە پرۆژەکەدا بەکاری بهێنین.

## کەل و پەلی بەکارهاتوو لە پشکنینی خشتەکەکاندا :-

١- خشتەکەکان و پلێتی بنیان (( دەبێت لە ماددەی ئاسنی سەبکراو یان پۆڵا بن )).

٢-چەمچە.

٣-رۆن بۆ چەورکردنی قاڵبەکان.

٤-ئامێرێکی تایبەت بۆ کوتانەوە کە سەرەکەی چوارگۆشە بێت ((٢٥ملم X ٢٥ملم)) و قورسیەکەی نزیکەی ١,٨کگم بێت.

٥-نموونەیەك لە کۆنکرێت بە نزیکی ٥کگم.

٦-فڵچەیەك بۆ چەورکردنی قاڵبەکان.

٧-ماڵنج.

٨-هەندێك جار ئامێری کوتانەوەی لەرزین یان مێزی لەرزین بەکاردەهێنرێت بەتایبەتی لە کاتی بوونی تاقیگەیەکی تەواودا.

٩-کەل و پەلی تایبەت بە خاوێن کردنەوەی



قڵەکان.

- سەتڵێك بۆ گوێزانەوەی نموونەکان.

- چەند سپانەیەك بۆ توندکردن و کردنەوەی بورغیەکانی قاڵبە خشتەکیەکان.

## قەبارەی خشتەکەکان:-

- قەبارەی پێوانەیی خشتەکەکان (٦ئینجX٦ئینج)ە ، بەڵام کاتێك چەگڵی بەکارهاتوو لە ٣/٤ئینج زیاتر نەبێت ، ئەوا دەتوانرێت قاڵبی (٤ئینجX٤ئینج) بەکاربهێنرێت ، لەگەڵ ئەمانەشدا هەندێك جار قاڵبی لولەکیش بەکاردەهێنرێت بۆ ئەنجامدانی پشکنینەکان.

## سیما و سیفەتەکانی قاڵبە خشتەکیەکان:-

- دەبێت رووی ناوخۆیان رێك و ساف بێت تاکو شێوەی خشتەکی تەواو بە کۆنکرێتەکە بدات، بەستنی لای قاڵبەکانیش دەبێت بە گۆشەی (٩٠ °) لەسەر یەکتر ببەسترێت.

- پێش تێکردنی کۆنکرێت بۆ ناو قاڵبەکان دەبێت ناوەکەی بە رۆنی تایبەت چەوربکرێت تاکو رێگا لە پێوەنوسانی کۆنکرێت و قاڵبەکە بگرێت . هەروەها قاڵبیش لە ژەنگ گرتن رزگار دەکات.

- هەر کەم و کورتیەك لەم رێنماییانە رەنگە کاریگەری خراپی لەسەر ئاکامی تاقیکردنەوەکان هەبێت.

## چۆنیەتی وەرگرتنی نموونەکانی کۆنکرێت:-

نموونەی کۆنکرێت دەبێت بە شێوازێك وەربگیرێت کە گوزارشت لە هەموو کۆنکرێتە بەکار هاتووەکە بکات ، بۆ ئەمەش پێویستە نموونەکان لە جێگای جیاواز و رۆژانە و لە کاتی جیاوازیشدا وەربگیرێت ، بۆ نموونە کاتژمێرەکانی وەرگرتن رۆژ لە دوای رۆژ






بچێتە پێشەوە بەم جۆرە وێنەیەکی روون لە بارەی کۆنکرێتەکەوە وەردەگریت ، دەبێت هەردەم هەوڵبدەین دوور بکەوینەوە لە نموونەی کێلەی شۆفڵ چونکە لە کاتی بەکارهێنانی شۆفڵدا دیاردەی ((Segregation)) روودەدات و نموونەکەش راست دەرناچێت.

لە کاتی کۆنکرێت کردن بە شێوەیەکی بەردەوام ئەوا هەر ١٢ دەقیقە و جارێك ، نموونەیەك وەردەگیرێت . بەگشتی ئەم نووسینانە لەسەر نموونەکان دەنووسرێت:

أ- رۆژ و کاتژمێری وەرگرتن.

ب- پلەی گەرما و کەش و هەوا.

ج- ژمارەی ئامێری تێکەڵەکەر.

د- ئەو شوێن و جێگایەی کۆنکرێتەکەی تێدا بەکارهاتووە.

## شێوازی پڕکردنی نموونەکان:-

١- دەبێت کۆنکرێت لە ناو خشتەکەکان باش بکوترێت بە چەشنێك کە هیچ جۆرە هەوایەکی تێدا نەمێنێت ، چونکە هەر مانەوەیەك ، دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی توانا.

٢- کوتانەوە یان بە دەست دەبێت یان بە ئامێری لەرزین.

لەباری دەستدا : بە ئامێری تایبەت (( لە لیستی ئامێرەکان باسکرا)) بە بەرزی ١٥سم کۆنکرێت دەکرێتە نموونەکەوە بە ٣ چینی یەکسان، هەر چینێك بە ٣٥ جار و زیاتر بە ئامێری کوتانەوەی دەستی دەکوترێتەوە . پاشان چینی دووەمی تێدەکرێت و بەو شێوەیە بەردەوام دەبێت تاکو سێیەم.

٣- دوای تەواوبوونی هەرسێ چین سەری نموونەکە بە ماڵێج رێك دەخرێت.



## هەنـــدێك تێبینـــی گـــرنگ لەمـــەڕ وەرگرتنـــی نموونـــەی خشتەكەكان:-

١- كاتێـك كـۆنكرێتی تێكـراو و زیـاد دەبێـت لەسـەری رووی نموونەكە ، ئەوا ئەو بڕە زیادەكە بە هێمنـی و بـە بـەكارهێنانی ماڵنج لە تەنیشتەكانیەوە بەرەو ناوەند لادەبرێت بە جۆرێك كە هەر دەنكێكی چەگڵی درشت هەبێت لەسەر رووەكە لادەبرێت.

٢- ئەگەر كۆنكرێتی تێكراو زۆر تەڕبوو ((رادەی ئاوی زۆربوو)) ، ئـەوا ئاوەكـەی دێتەسـەرەوە و مـەوادی رەقـیش دەچـێتە خـوارەوە ، بـۆ ئـەوەی كـۆنكرێتی نـاو قاڵبەكـە لەگـەڵ رووی قاڵبەكـەدا یـەكبێت ئەوا بە بڕی ١-٢ملم رێگـا دەدرێـت كـە كۆنكرێت بەرزتر بێت لەسەر رووەكە.

٣- دوای تـەواوبوونی وەرگرتنـــــــــــی نموونـــەكان ، ئـــەوا دەبێت دەست بەجێ بگوێزرێتـــــــــەوە جێگایەكی دوورە دەست و بۆماوەی٢٤ كاتژمێر هەڵبگیرێت.

٤- ئاودانی نموونەكان دەبێت بە رێك و پێكی بێت ، دوور بـن لـە شوێنێك كە هۆكاری لەرزینی تێدابێت.

٥- سـەری نموونـەكان بـە گوشـێكی تـەڕكراو و پاشـان چـینێك نایلۆن دادەپۆشرێت بۆ ماوەی (١٦-٢٤) كاتژمێر لە (١٥-٢٥) پلەی گەرمادا دەبێـت . هـەروەها پێویستیشـە جیـاوازی نێـوان پلەی گەرما لە رۆژەكەدا تۆماربكرێت.

## كردنەوەی قاڵبەكان:-

- دوای ١٦ بۆ ٢٤ كاتژمێر، قاڵبەكان دەكرێنەوە، بەشێوەیەكی هۆشیارانە ، تاكو نموونەكان (كە هێشتا تەڕ و لاوازن) نەشكێن و درز نەبەن، بەتایبەتیش سووچەكانی، كە ئەمانـە كاریگـەریان دەبێت لەسەر ئاكامی پشكنینەكان.

- باشترین رێگاش بۆ لێكردنەوەی قاڵبەكان ئەوەیە كـە یەكـەم جـار بنكەكـەی لێ بكرێتـەوە ئینجـا تەنیشـتەكانی ، ئینجـا هەریەكەیان ژمارەیـەكی دیاریكراوی لەسـەر دەنووسـرێت ، بـە ماددەیەك كە بە ئاو لانەچێت ، پاشان دەكرێتە ئاوی خاوێنەوە كە پلەی گەرمای لە نێوان ١٨-٢٢ پلەدا بێت.

## گوێزانەوەی نموونەكان بۆ تاقیگە:-

لە كاتی گوێزانەوەی نموونەكان بۆ تاقیگە ئەوا پێویستە لە كەشێكی شێدار دا بپارێزرێت چ بەداپۆشینی بە گوشی تەڕ یان لە ناو گوشێكی تەڕدا ، كـە دەبێت لـە مـاوەی ٢٤ كاتـژمێردا پـێش پشكنین بگەنە تاقیگە و تەمەنیان لە نێوان ٣-٧ رۆژدا بێت.

بەپێی رێنماییە ئەندازیارییەكانی كاروباری بیناسازی ٢ ، دەبێت ئاكامـەكانی پشـكنینی خشـتەكەكانی كۆنكرێـت بـۆ قـاڵبی (١٥٠ملم$\times$١٥٠ملم)* بەپێی ئەم خشتەیەی خوارەوە بێت ئینجا لە سنووری مواسەفاتدا دەبێت.

ئەم ئاكامانە كاتێك رەچاودەكرێن كە چیمەنتۆی بـەكارهاتوو لـە جۆری پۆرتلاندی بێت

| ژ | جۆری كۆنكرێت | كەمترین بەرگری بۆ شكاندن بە كگم/سم2 بۆ 7 رۆژ | | كەمترین بەرگری بۆ شكاندن بە كگم/سم2 بۆ 28 رۆژ | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | پشكنینی سەرەتی | پشكنینی كۆ | پشكنینی سەرەتی | پشكنینی كۆ |
| 1 | 2 1:1 | 240 | 210 | 360 | 310 |
| 2 | 3 1.5 1 | 200 | 175 | 300 | 280 |
| 3 | 4 2:1 | 165 | 140 | 240 | 210 |
| 4 | 5 1.5 1 | 125 | 115 | 200 | 176 |
| 5 | 6 3:1 | – | – | – | 115 |

## كۆتایی:-

پشـكنینی خشـتەكەكانی كۆنكرێـت ئـەو رێگایەیـە كـە بـە هۆیـەوە ئێمـە دڵنیـا دەبـین لـەوەی جـۆری كـۆنكرێتی بـەكارهاتوو بـەپێی سـیفەتە ئەندازەییەكانـەو دەگونجێـت لەگـەڵ ئـەو نەخشەكێشـانەی بـۆ پرۆژەكـە كـراوە ، دڵنیـا دەبـین لەسـەر كـەوتنی پرۆژەكـانی بیناسـازی و بوارەكـانی پـردە كۆنكرێتیـەكان، مـاوە بگوترێـت كـە برگـەی كوتانـــەوەی لـــەم جـــۆرە پشـــكنینەدا زۆر گرنگـــە چـــونكە لێكۆڵینـەوەكان ئـەوەیان سـەلماندوە كـە ١٪ لـە هـەوا لـە نـاو كۆنكرێتدا ٥-٦٪ لە توانای كۆنكرێت بۆ بەرگری كەم دەكاتەوە.

## سەرچاوەكان:-


١- Man of the job, concrete test cubes

٢- مواصـفات الأعمـال الإنشـائية – الطبعـة الثانيـة / وزارة الإسـكان و التعمير.

٣- المواصفات الفنية العامة ١٩٧٥ المجلد الأول.

# سیستەمێکی نوێ بۆ کۆنترۆڵ کردنی دابەش بوونی گاز لەبزوێنەرەکاندا (HEUI System)



ئەندازیار/ رزگار ئەحمەد محەمەد

ڕۆژ بەڕۆژ بیرۆکەی نوێو داهێنانی تازە ئامێرو سیستەمی ئەوتۆ دەخەنەڕوو کە سەدان گیروگرفتی هەڵواسراوی پێ چارەسەر دەکرێ، جگە لەم خزمەتە بەرچاوەی کەپێشکەش بەمرۆڤایەتی دەکات لەسەرجەم بوارە جیا جیاکاندا، بۆیە پێویستە ئەم سیستەم و ئامێرانەش بەشێوەیەکی زانستیانە شی بکرێنەوەو لەبنەماکانیان بکۆڵدرێتەوە.



بەم شێوەیە سیستەمی کۆنترۆڵی دابەش کردنی گاز لەبزوێنەرەکاندا کەپێی دەڵێن (هیوی سیستەم) توانی بەسەر کۆمەڵێك گیروگرفتی بزوێنەرە دیزلیەکان دا زاڵ بێت، کەپێشتر بەڕێگایەکی میکانیکی لەڕێگای (پەمپی گاز + نۆزل) بڕی گازی پێویست دابەش دەکراو دەخرایە ژووری سووتان و سەر پستنەکان، بەلاَم ئەمڕۆ زۆر لەئامێرەکانی وەك (شۆفەل و بارهەلگرو گینەرەیتۆرەکان) لەسەر ئەم سیستەمە نوێیە کار دەکەن کە ئەویش سیستەمی هیویە (HEUI sys.) ئەم سیستەمەش بریتیە لەئامێرێك کە لەشێوەی ژمارە (١)دا دیارە، کەپێی دەڵێن (Injector) یان (HEUI injector) واتە (پژێنەری هیوی) کە هەر بەناوی سیستەمەکە ناونراوە، بەلاَم لەڕاستیدا وشەی (HEUI) بریتیە لەکورتکراوەی چەند زاراوەیەك.

H- Hydraulically Actuated.
E- Electronically Controlled.
U- Unit.
I- Injector.

واتە ئەم ئامێرە تایبەتەش (HEUI Injector) کە پێك هاتووە لەکۆمەڵێك پارچە ئامێری میکانیکیو کرداری فیزیاییو کارەبایی کە لەشوێنی نۆزلی بزوێنەرە کۆنەکان دادەنرێت واتە لەسەر پستنەکان، بەلاَم بەشێوەیەکی گشتی بیرۆکەی کارکردنی جگە لەپێك هاتەی خۆی دەکەوێتە ژێر دوو کرداری سەرەکییەوە کە وەك لەناوەکەی هاتووە (Hydraulically Actuated و ElectronicallyControlled) بۆیە پێویستە ئەم دوو کردارە شی بکەینەوە بۆ ئەوەی چۆنیەتی کارکردنی ئەم ئامێرە بخەینە ڕوو، ئێستا ئەگەر کرداری یەکەم وەربگرین واتە (کرداری هایدرۆلیکی) (Hydr. Actuated). ئەویش لەڕاستی دا هیچ ماددەی هایدرۆلیکی لە بزوێنەرەکە نییە، بەلاَم مەبەست لەم هایدرۆلیکە بریتییە لەڕوونی ناو بزوێنەرەکە (ڕوونی بەکارهاتوو) کە بەهۆی پەمپێکی تایبەتی پەستێوراوە کەپێی دەڵێن (Hydrolic Pump) یان (Rexroth P.) بۆ پلەی (450- 3000 psi) بەم شێوە ڕۆنەکە دەچێتە باری پاڵەپەستۆی بەرزەوە ( High oil pressare) ئینجا دەچێتە ڕۆگەیێکی (مەمەڕێکی) تایبەتییەوە کەپێی دەڵێن (Oil Rail) کە پرژێنەری هیوی تێدا بەستراوە، جا لەڕێی چاوی (کونی ڕوونەکە) دەچێتە ناو ئامێری پرژێنەرەکە، بەم پاڵەپەستۆیە زۆرەوە کاتێك دەچێتە ناویەوە دەبێتە هۆی پەیدابوونی جووڵەی میکانیکی و کردنەوەی دەرچەکان (ڤالڤەکان) (Valves)، بەلاَم تەواو ئەنجام نادرێ چونکە ئامێرەکە پێویستی بەکرداری دووەم دەبێت، کە بریتیە لەکرداری (کۆنترۆڵی ئەلیکترۆنیکی) (Electronically Controlled) واتە ئامێری هیوی دەکەوێتە ژێر کاریگەری کارەباییەوەش، کە ئەویش بریتیە لەوەرگرتنی ترپەیەکی کارەبایی بەبڕی (110 vd.c)

بۆ سەر پێچەکەی (Solenoid) کە دەکەوێتە بەشی سەرەوەی ئامێری هیوی، ئەم ترپەیەش لەئامێرێکی تایبەتییەوە دەردەچێت کەپێی دەڵێن (ECM) واتە (Electronic Control Madule)، کە لەشێوەی ژمارە (٣)دا دیارە، ئەم ئامێرەش بریتیە لەئامێرێکی ئەلیکترۆنیکی بەرنامەدار (Micro Processor) کە بەبەرنامەی تایبەت (Software) کار دەکات، جیاکەرەوەکەشی بریتین لە ( -32 J-19- 39 Communication Data ) (bit, 24 MHZ processor Link) لەسەرەتادا ئەم ئامێرە کۆمەڵێك نیشانەو کرداری جیا جیا لەچەند هەستیارێك (Sensors) کە لە بزوێنەرەکە بەستراون وەردەگرێت کە هەریەکەیان بەرپرسن لەسەر کارلێکێك هەستیارەکان وەك (EOT/ CPS/ ECT/ EOP/ MAP/ ICP) کە باسکردنیان زۆری دەوێت چونکە لەناوەکەیانەوە دیارن کە هەریەکەیان بەرپرسن لە (پلەی گەرمیو پاڵەپەستۆی رۆونەکەو خێراییو پلەی هەواو شوێن..هتد) ئەم هەستیارانەش لەوێنەی ژمارە (٣)دا دەردەکەون، ئینجا ئەم کردارانە لەناوی ئامێرەکە (ECM) شی دەکرێنەوەو دەخوێنرێنەوە وە بەهای خۆیان بۆ دیاری دەکرێت ئەگەر هەر جیاوازیەك لەبەهاکان هەبێت ئەوا

Sensors —i/p→ [ processing ] —o/p→ Injectors

ئامێری (ECM) بەهۆی کێبلەوە بەستراوە بەسەندوقێك بۆ خوێندنەوەو دیاری کردنی بارە تێك چووەکان ئەویش لەچەند رێگایەك ئاشکرا دەبێت:-



شێوەی ژمارە (٢) ئامێری ECM



شێوەی ژمارە (١) بەشەکانی پرژێنەری هیوی

أ- هێمای گڵۆپەکانی سەندوقەکەوە (سوورو زەرد).

ب- کۆمپیوتەر PC- Portable.

ج_ ئامێری تایبەتی (Diagostics tools).

ئەگەر هەموو کردار و بەهاکان گونجاو بوون ئەو کاتە ئامێری (ECM) هەڵدەستێت بەناردنی ترپەی (پەڵس) (Pulse) کارەباییەکە کە بەهاکەی (١١٠ ڤۆڵتی بەردەوام D.C)یە بۆ سەر پێچەکی ئامێری هیوی (پرژێنەری هیوی) لەم کاتەدا هێزێکی موگناتیسی پالە پەستۆیەکی ئەوتۆ دروست دەکات لەناوەوەی ئامێرەکە.

ئێستا ئامێری هیوی (پرژێنەری هیوی) دەکەوێتە ژێر فشاری دوو پاڵەپەستۆوە ئەویش پاڵەپەستۆی هایدرۆلیکیو ئەوی تریان کارەبایی ئینجا لەنێوانیاندا جیاوازیەك دروست دەبێت کەدەبێتە هۆی پەیدابوونی جووڵەیەکی میکانیکی لەپستن و ( IntersiFier piston) و دەرچەکان (Valve) و سپرینگەکانی (Springs) ئامێرەکە، لەئەنجامدا دەبێتە هۆی کرانەوەی چاوو (کونی گاز).

ئینجا بری ئەو گازەی کە لە (lift feed Pump) واتە فیت پەمپ دەردەچێت یەکسەر دەچێتە ناو رۆگەی (ممر) گاز واتە پێویستی بە (fuel pump) نییە، (پەمپی گاز) پاش ئەوەی ئەم گازەش پەستراوە بۆ پلەی (65 pci) ئینجا ئامێری هیوی لەناو ئەم رۆگەیە (مەمەرە) بەستراوە بۆیە گازەکە دەگاتە چاوی (کونی گازی) ئامێرەکە لەوێوە دەچێتە ناو ئامێری هیوی کە لەئەنجامی پاڵەپەستۆیەکان چاوەکە کراوەتەوە (واتە لەکاتی کارکردنی بزوێنەرەکەدا) ئینجا لەناو ئامێری هیوی بری گازەکەش ئەکەوێتە ژێر فشەری پستنی ئامێرەکەو لەپاڵەپەستۆی زۆرەوە لەکونی

ـەرزیەکانی کۆتایی ئامێری هیوی (Nozzle Assembly) دەپرژێتـــە ســـــەر ژووری پســــــتنەکانی بزوێنەرەکان، بەم شێوەیە توانرا بری گازی پێویست کۆنترۆڵ بکرێت بـۆ چـوونە ســـەر پستنەکانی بزوێنەرەکـــە (ژووری ســـووتان) بەشـــێوەیەکی رێـــك و پێکـــی بەرنامەدار.



شێوەی ژمارە (٣) سیستەمی هیوی یەکەواوی

ئینجا ئەگـەر بگەرێینـەوە سـەر چۆنیەتی کارکردنی پرژێنەرەکان و بـۆ دیـاری کردنـی کرانـەوەیان و پێویسـتیان بـەبری گـاز بـۆ سـەر پسـتنی بزوێنـەری بەرامبـەر واتـە بتـــوانین (injector 1) لەگـــەڵ (Piston 1) بکرێنـەوەو بەپێچەوانەشـەوە، ئـەوا ئـامێری (ECM) لـەرێگای هەستیارێکی تایبەتییـەوە کـەپێی دەڵێن (Camshaft Position Sensor) (cps) کــە لەســـەر (Camshaft) بەســـتراوەو خێرایی دەخوێنێتەوەو شوێنی پستنەکان دیاری دەکات لـەرێگای نیشانەی تایبەتی خۆی، ترپە دەنێرێت بـۆ سـەر ئـامێری (ECM) ئینجـا لەوێشـەوەو بـۆ سـەر پرژێنـەری (injector)ی پێویسـت (Piston)، کە ئایە ئـەم پستنە لەحاڵـەتی سـەرەوە (بـەرز) یـان خـوارەوە (نـزم) دایـە، وەك لـە وێنـەی ژمـارە (٤)دا دیـارە. بەشـێوەی گشـتی دەتـوانین لـەرێگای پرژێنـەری هیـوی (HEUI injector) بری گازی تێکردوو (Per Stoke) دەگاتە (300 mm 3).



شێوەی ژمارە (٤) CPS

ئەگـەر بـەووردی لەسوودەکانی ئـەم سیستـەمە بکۆڵینـەوە ئـەوا دەرکـەوتووە ئـەم بزوێنەرانـەی کـە بـەم سیسـتەمە کـار دەکـەن چالاکیەکی باشیان هەیـە دەگاتـە (٩٥٪) (effeciency)و دووکـەڵی کـەم دەبینرێـت بـەهۆی نـەبوونی پـەمپی گـاز واتـە سـووتان رێژەیەکی باشی وەرگرتووەو دەگاتە سەرووی (23, 500 psi)، یان (162 Mpa) لەحاڵـەتی (peak injection)، کاتێك ئـەم سیسـتەمە لەگـەڵ بزوێنـەری گینـەرەتۆرەکان بەسـترابێت ئـەوا دەتـوانین یەکسەر (100% load) بارێکی تەواوی خۆی لێ بدرێ هـەتا ئەگـەر لەکاتی هەستانیش بێت، چونکە سووتان و بـری گـازی پێویسـت بەشێوەیەکی خێراو کتوپڕ ئامادە دەبێت و کارلێك دەکات، بـەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم سیستـەمە، بەسیستـەمێکی ئـاڵۆز دادەنرێـت ئـەویش لـەکاتی چـاککردنەوەی بـەردەوام (صـیانە المسـتمرە) بەتایبـەتی چـاککردنەوەی ئـامێری هیـوی (پرژێنـەری هیـوی) کـە پێکهاتوویـەکی زۆر ئـاڵۆزی هەیـــە زۆر کـــەم چـاکدەکرێتەوە، بەتایبەتی کاتێك بە دزەکردنی برێك ئاو بۆ ناو گـاز دەبێتـە هـۆی شکانی دەرزی ئامێرەکە، جـا لـەم کاتـەوە دەبێت فـرێ بـدرێت، ئەمـەش گـران دەوەسـتێت چـونکە لـەرووی تێچـوون زۆری تـێ دەچێت ئەمـە جگـە لـەوەی کـە ئـامێری (ECM) کـە زۆر جـار بەرنامەکەی ناوەوەی (Reset) واتـە سـفر دەبێـت ئـەوکاتیش زۆر بـەگرانی بەرنامـەدار دەکرێتـەوە) هـەروەها زۆر لەهەسـتیارەکانی (Sensors) کـە لەگـەڵ بزوێنەرەکـەو (ECM)ە کـە بەسـتراون زۆر ناسکن و پێویستیان بەچاودێرییەکی ورد هەیە.

ئامێری ژمارە

لەسەر داوای ئەندازیارانی بەڕێزدا، ئەم گۆشەیەمان تەرخانکرد بۆ دروستکردن و بەرچاوخستنی هەندێك ئامێری كارەبایی كە لە ژیانی ڕۆژانەدا سوودیان هەیە، دەرگای ئەم گۆشەیەش بەڕووی هەر ئەندازیارێكی بەڕێز والایە كە داهێنان یاخود ئامێرێكی دروست كردووەو دەیەوێت باسی لێوەبكات.. لەگەڵ ڕێزماندا . **ئەندازیار**

# چی لە بارەی چرای فلۆرسنت دەزانی




**وەرگێڕان وئامادەكردنی :**

**ئەندازیار جەرجیس عوسمان**

**ئەندازیاری ڕاوێژكار لە بەشی چاككردنەوەی كارەبا لە هەولێر**


بێگومان دوای داهێنانو بەكارهێنانی چرای جۆری هەڵمی سۆدیۆم (Sodium vapor lamp)و چرای جۆری هەڵمی جیوە (Mercury vapor lamp)، گەورەترین پێشكەوتن لەبواری سیستەمی ڕووناكیدا داهێنانی چرای فلۆرسنت بوو، ئەویش لەساڵی١٩٣٨ز. ئەم چرایەش تارادەیەك بەچرای هەڵمی جیوە دەچێت كەوا لەوەوپێش بەكاردەهات، ئەوە نەبێت كەوا دیوی ناوەوەی لوولەشووشەكە بەجۆرێك لەماددەی كیمیاوی ڕووپۆشكراوەكە توخمی فۆسفۆرە، بێگومان توخمی فۆسفۆریش كاتێك بەر تیشكی سەرووی وەنەوشەیی (Ultra violet rays) دەكەوێت دەبریسكێتەوەو ڕووناكی پەخش دەكات. فۆسفۆریش زۆر جۆری هەیە، و هەر جۆرەی ڕەنگێكی تایبەتی دەبەخشێ، كاتێك بەر تیشكی سەرووی وەنەوشەیی دەكەوێت، بۆ نموونە: خوێی كادمیۆم ڕووناكی پەمەییو، سلیكاتی توتیا ڕووناكی سەوزو، كالیسیوم ڕووناكی شینو، مەگنیسیۆم ڕووناكی شینی كاڵ دەبەخشێ. بە تێكەڵكردنی ئەم جۆرانەش بەڕێژەی دیاریكراو دەتوانرێت زۆر جۆرە ڕووناكی ڕەنگاوڕەنگی دی بەرهەم بهێنرێت.

## چرای فلۆرسنت لە چی پێكدێت؟

هەروەكو لەوێنەی(١)دا دیارە چرای فلۆرسنت لە لوولەیەكی




وێنەی (١) پێكهاتنی چرای فلۆرسنت

ووشەی داخراو پێکدێت، دیوی ناوەوەی ەمەدەی فۆسفۆر ڕووکەشکراوەو لە هەوا ەنکراوە، لەجیاتی هەوا کەمێك گازی ئارگۆن و حە دلۆپێك لەجیوەی تێکراوە، لە هەردوو ەری لوولەشووشەکە دوو( فلمنت) هەن، دە وەك کۆیلی گەرمیبەخش، جارێکیش وەك ەکترۆد (Electrodes) کاردەکەن، لەپێش مەنتەکان دوو پارێزەر -لە تەلی ئەستوور ەوستکراون- بۆپاراستنی فلمنتەکان دانراون. ەی کارەبای فلمنتەکان بەسویچێك کۆنترۆل ەکرێت پێیدەڵێن: (Glow type starter)و مەرێك لەگەڵ فلمنتەکان بەستراوە، هەروەها لاستێك* (Ballast) بەشێوەی یەك لەدوایەك لەگەڵ سترتەر (Starter)و چراکە بەستراوە. بڕوانە وێنەی (٢).

ئەم بالاستە دوو کاری سەرەکی ئەنجام دەدات:

١-ڤۆلتیەکی بەرز دروستدەکاتو دەیخاتەسەر ئەلکترۆدەکان مەنتەکان).

٢-لامپەکە لە سووتان و تێکچوون دەپارێزێ.

## چۆنیەتی کارکردنی چرای فلۆرسنت

کاتێك سویچی سەرەکی لامپەکە دادەگیرسێت یەکەمجار ەرووی کارەبا بە فلمنتەکاندا ڕەتدەبێت ئینجا گەرماییەك ەروست دەبێتو بەهۆیەوە جیوەکە دەبێتە هەڵمو ولەشووشەکە پڕدەبێت لەهەڵمی جیوە، هەر لەم کاتەدا ڤۆلتیەکی بەرز دەخرێتە سەر فلمنتەکانی هەردوو سەری ولەکەو لەوکاتەدا وەك ئەلکترۆدێك (Electrodes) کردەکەنو دەبنە هۆی بە ئایۆنبوونی گازی ئارگۆنەکەو هەڵمی جیوەکە، بەمەش تیشکی سەرووی وەنەوشەیی (Ultra violet rays) دروستدەبێت، ئەم تیشکەش بەر فوسفوری ناو ولەشووشەکە دەکەوێتو دەبێتە هۆی پەیدابوونی ڕووناکی، ێرەدایە چراکە دەستدەکات بە کارکردن و ڕووناکی ڵاودەکاتەوە.




وێنەی (٢) بالاست و بازنە کارەبای فلمنتەکان

بۆ ئەوەی چراکە بەردەوام بێت لە کارکردن بازنە کارەبای فلمنتەکان دەپچڕێن، ئیدی فلمنتەکان وەك ئەلکترۆدێك کاردەکەن.

لەم زانیاریانەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێت چرای فلۆرسنت پێویستی بەدوو بازنەی کارەبا هەیە:

یەکەم:- بازنە کارەبای فلمنتەکان، کە داخراو دەبێت تاوەکو جیوەکە گەرم دەکاتو دەبێتە هەڵم ئینجا دەکرێتەوە.

دووەم:- بازنەی ڤۆلتیەی بەرز، کەوا ڤۆلتیەکی بەرز دروستدەکات لەنێوان دوو ئەلکترۆدەکان بۆ بە ئایۆنبوونی هەڵمی جیوەو گازی ئارگۆنەکە لەناو لوولەشووشەکە.

## چۆنیەتی کارکردنی بازنەکارەبای فلمنتەکان

هەروەکو لەپێشدا باسمان کرد، بازنەکارەبای فلمنتەکان بە سویچێك کۆنترۆل دەکرێت وەك لەوێنە(٢)دا دیارە، ئەم سویچە لەدوو خاڵی بەریەککەوتن پێکدێت: یەکێکیان جێگیرەو ئەویتریان سەربەستە (ناجێگیرە)، خاڵە ناجێگیرەکە بەشریتێکی کانزایی (Bimetallic strips) بەستراوەتەوە، هەردوکیشیان خراونەتە ناو شووشەیەکی داخراو کە پڕە لەگازی ئارگۆن.. بەر لەداگیرساندنی سویچی سەرەکی چراکە هەردوو خاڵەکە لەیەکدی دابراون بەڵام، کاتی داگیرساندنی سویچەکە، تەزوویەکی کارەبایی (٢٢٠) ڤۆلتی گازە ئارگۆنەکەی ناو شووشەی ستارتەرەکە ئایۆناوی دەکاتو لەئەنجامدا تەزوویەکی کەم بەنێوان دوو خاڵەکەدا تێپەڕدەبێت، گەرمییەك دروست دەکات

بەهۆیەوە شریتە کانزاییەکە دەچەمێتەوەو هەردوو خاڵەکە بەریەك دەکەون ئینجا ڕۆیشتنی تەزوو بەناو گازەکەدا دەوەستێتو بەدوو خاڵەکەدا دەڕوات بۆ بازنەی فلمنتەکانو ئەوانیش گەرمدەبنو دەبنەهۆی بەهەڵمبوونی جیوەکە. وەستانی ڕۆیشتنی تەزوو بەناوگازەکەدا دەبێتە هۆی ساردبوونەوەی شریتەکانزاییەکەو خاڵەکانی بەریەککەوتن لەیەك جیا دەبنەوە ئەم کارەش زیاتر لەجارێك دووبارە دەبێتەوەو لەئەنجامدا بازنەی فلمنتەکان دەپچڕێن. ئەگەر تێبینی بکەی ستارتەرەکە هاوڕێك بەستراوە لەگەڵ چراکە، کاتێك چراکە دادەگیرسێ ڤۆڵتیەی سەرستارتەرەکە زۆرکەم دەبێتەوە بەشێوەیەك دەگاتە بڕێکی وا تەنها وادەکات گازە ئارگۆنەکەی ناو شووشەکە ببریسکێتەوەو دوو خاڵەکەی بەریەککەوتن بەکراوەیی بمێنێتەوە، بەم چەشنە بازنەکارەبای فلمنتەکان کراوە دەبێت. ئەو بڕە گەرمییەی فلمنتەکان دروستیان کردبوو لەگەڵ ئەو بڕە گەرمییەش کە لە بەئایۆنبوونی هەڵمی جیوەکە بەرهەم دێت بەسە بۆ ئەوەی جیوەکە بەردەوام لەناو لوولەشووشەکە ببێتە هەڵم.

شایانی باسە بارگەگرێك (Capacitor) کە بڕەکەی (٠,٠٢) مایکرۆفارادە لەناو بەرگی ستارتەرەکە هاوڕێك بەستراوە لەگەڵ دوو خاڵی بەستنی ستارتەرەکە، وێنەی (٢). کاری ئەم بارگەگرە: نەهێشتنی بەیەکداچوونی شەپۆلی ڕادیۆییە. نەبوونیشی دەبێتە هۆی دروستبوونی لەرەرەرێك بە ڤۆڵتیەکی لەرەلەر بەرز (High frequency voltage oscillations) لەنێوان دووخاڵی بەستنی ستارتەرەکە.

## بازنەکارەبای ڤۆڵتیەی بەرز

ئەگەر سەرنج بدەیتە بازنە کارەبای ڤۆڵتیەی بەرز دەبینی بالاستێك بەشێوەی یەك لەدواییەك لەگەڵ ستارتەرەکەو چراکە بەستراوە. کاتێك بازنەکارەبای فلمنتەکان دەپچڕێ، لەبالاستەکە -بەڕێگەی هاندانێکی خۆیی- هێزێکی پێچەوانەی بەرزی پاڵنەری کارەبایی (قوه دافعە کهربائیە عکسیە عالیە) دروستدەبێت بڕەکەی بەنزیکەیی دەگاتە (٨٠٠-١٠٠٠) ڤۆڵت. ئەم ڤۆڵتیە بەرزە دەخرێتەسەر ئەلکترۆدەکانی چراکەو دەبێتە هۆی بەئایۆنبوونی هەڵمی جیوەکەو ئەم بەئایۆنبوونە زیاددەکات تاوەکو دەبێتە هۆی ڕۆیشتنی تەزوویەکی زۆر بەناوچراکەداو لەوانەیە ببێتە هۆی سووتانو لەکارکەوتنی چراکە. بەڵام لێرەدا بالاستەکە دوای ئەوەی ڤۆڵتیەی خستبووە سەر ئەلکترۆدەکان بۆ دەستپێکردنی بە ئایۆنبوونی هەڵمەکە، ئێستا وەك ئامێرێکی پاراستن کاری دووەمی ئەنجام دەدات ئەویش کارکردنیەتی بۆ سنووردارکردنی ڕۆیشتنی تەزوو بەناو چراکەدا بەجۆرێك لە تێکچوونو سووتان دەیپارێزێت.

## لایەنە چاکەکانی چرای فلۆرسنت بە بەراوردکردنی لەگەڵ چرای تەنگستن

١-زۆرترین بڕی ڕووناکی دەدات، بۆ نموونە، چرای فلۆرسنتی سپی نزیکەی ( ٢,٥) کەندەل/وات ڕووناکی دەدات، کەچی چرای تەنگستن ( ١) کەندەل/ وات ڕووناکی دەدات.

٢-ڕووناکییەکەی ئازاری چاو نادات، چونکە بریسکانەوەی کەمە.

٣-دەتوانرێت زۆر جۆرە ڕووناکی ڕەنگاوڕەنگی لێ دروست بکرێت.

٤-دەتوانرێت بەزۆر شێوە دروست بکرێت: ڕاست، بازنەییو نیوەبازنەیی، ئەمانەش وا دەکەن بۆ کاری دیکۆرسازی لەباربێت.

٥-ڕووناکی فلۆرسنتی سپی زۆر لەڕووناکی سروشتی ڕۆژ نزیکە.

٦-چرای تەنگستن پلەی گەرمییەکەی دەگاتە (٣٠٠٠) پلەی سەدیو ڕووناکییەکەی زەردباوە، بەڵام چرای فلۆرسنت ڕووناکی سپی دەداتو پلەی گەرمییەکەی لە ( ٥٠) پلەی سەدی تێپەڕناکات، ئەمەش دەبێتە هۆی درێژکردنی تەمەنی چراکە.

٧-بە زۆر جۆر درێژی دروست دەکرێت لە( ٦) ئینجەوە تا( ٤) پێ.

*** بالاست: بریتییە لەچەند ئەلقەیەکی تەلی بارێك کە لەدەوری چەند پارچە ئاسنێکی تەنکی بەیەکەوەلکاو ئاڵاوە.**

**سەرچاوە:**

**Abraham Marcus and Charles M.Thomson , Electricity for Technicians , 2nd Edition.**



# پڕۆژەی بنیاتنانی دەریاچەکان..

## هەوڵێکی پێشکەوتوو بۆ ڕێکخستنی سەرچاوەکانی ئاو



**ئەندازیار: وریا عەلی ئیسماعیل**
**ب.گ. ئاودێری و سەرچاوەکانی ئاو**

یەکێك لەڕێگەکانی ڕێکخستن و دەستەبەرکردنی سەرچاوەکانی ئاو، بنیادنانی بەنداوە خۆڵییە بچووکەکانە. ئەو پڕۆژەیە گرنگی لەوەدا بەدەردەکەوێ کە لەگەڵ بونیادو شێوەی ناوچەکە زۆر گونجاوە، ئەگەر سەیری تۆپۆگرافیای کوردستان بکەین دەبینین زۆربەی گوندو ئاواییەکان لەنزیك سەرچاوەکانی ئاو، کانی، کارێزو بەست بنیادنراون. ناوچەکە بەزستانێکی باراناوی سەختدا تێپەڕدەبێ، کە تێکڕای باران بارین لەهەندێ ناوچەدا دەگاتە (١٠٠٠ ملم)، بێ ئەوەی سوود لەو ئاوە وەربگیرێ، لەکاتێکدا هاوینێکی وشکی بێ بارانی هەیە کە تێکڕای باران بارین لەم وەرزەدا لەزۆربەی ناوچەکاندا دەگاتە (٠ ملم).

بەواتایەکی تر لەوەرزی زستاندا بەستەکان بەرێژەیەکی زۆر ئاوی پێدا دەڕوا زۆر زیاتر لەئاوی پێویست بۆ دانیشتوانی ناوچەکە، واتا بەشێکی زۆر لەو ئاوە کە بەرێژەی (١٠/٩

دەخەملێنرێت) بەفیڕۆ دەچێ. لەکاتێکدا هەمان بەست لەهاویندا تەنانەت ڕێژەی (١٠/١) پێداویستیەکانی ناوچەکە دابین ناکات. جا لێرەدا ڕۆڵی ڕێکخستن‌و دابەشکردنی سەرچاوە ئاوییەکان بەهاوکێشەیەکی گونجاو کە پێداویستییەکان (Demand) لەگەڵ هەبوو (Available) بەتەریبی بهێڵێتەوە، دێتە پێشێ، یەکێك لەگرنگترین ئەو چارەسەریانەی بۆ لەیەك نزیك کردنەوەی پێداویستی، لەگەڵ هەبوو؛ بنیادنانی بەنداوە بچووکەکانە.

لەچەند دێڕی خوارەوە بەکورتی باس لەسوودەکانی دەریاچە بچووکەکان دەکەین.

دیارە ئەو بەنداوانەی کە دەبنە هۆی دروست بوونی دەریاچە بچووکەکان ڕۆڵێکی بەرچاو دەگێڕن لەدووبارە ئاوەدان کردنەوەی دێهاتەکان سەرەڕای ئەوەش گرنگترین سوودەکانی لەم چەند خاڵەدا دەخەینەڕوو.

**١-ئاودانی مەڕو ماڵات:-**

ئاشکرایە پیشەی سەرەکی خەڵکی گوندنشین، ئاژەڵدارییە لە پاڵ کشتوکاڵ‌و ڕەزگەری. دەریاچەکە ئەو ئاوەی کە کۆی کردۆتەوە لەوەرزی زۆر بارانیدا، لەوەرزی قات‌و قڕی ئاودا وەك سەرچاوەیەکی بەکەڵك بۆ ئاودان‌و پێداویستییەکانی ئاژەڵ بەکار دێ. لێرەدا ئەندازیاری دارێژی پرۆژەکە دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگرێ کە بڕی ئاوی گلدراوە لەناو دەریاچەکەدا کەمتر نەبێ لەو بڕەی کە دەبێتە هۆی تێك چوونی (Contaminate) جۆری ئاوەکە لەڕووی کیمیاییەوە، هەروەها گۆشەی لاری ڕۆخەکانی دەریاچەکە بەجۆرێك بێ کە ئاژەڵ بەئاسانی بگاتە ئاوەکە لەپلە جیاوازەکانی ئاستی ئاو لەناو



پرۆژەی دەریاچەی باوەخەلان – لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ئاودێری هەولێر جێبەجێ کراوەو بەهاوکاری ڕێکخراوی فاو

دەریاچەکەدا. سەرەڕای ئاودانی مەڕو ماڵات بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەسەر دەریاچەکە، دەتوانرێ سوود لەبۆڕی ڕۆگەیی (Trickle Tube)دا وەربگیرێ کە بەناو جەستەی خۆڵێتی بەنداوەکەدا هاتووە، بە بەستنەوەی بۆڕی پلاستیکی‌و گەیاندنی ئاوەکە بۆ ناو حەوزی ئامادە کراوی کۆنکریتی‌و لەوێشەوە بۆ کوڵەکان، ئەمەش کارێکی زۆر ئاسان‌و کەم نرخە بەتایبەتی ئەگەر شوێنی بەنداوەکە بەرزتر بێ لەشوێنی ئاژەڵداران (گوند).

**٢-بۆ مەبەستی ئاودێری:-**

بێگومان دروست بوونی دەریاچەکە لەناوچەکەدا سوودێکی زۆری دەبێ بۆ مەبەستی ئاودێری. بۆ ئەم مەبەستە ئەندازیاری ئاودێری دەتوانێ سوود لەبنیادنراوی بۆڕی ڕۆگەیی (Trickle Tube) وەربگرێت، بەدارشتنی جۆگەی کۆنکریتی لە (Bottom Outlet) دوا بەشی بۆڕیەکە لەپشتە بەشی (D/S) بەنداوەکە بۆ سەر کێڵگەی جوتیاران، ئەمە لەکاتی بەکارهێنانی جۆری ئاودێری بە بەرۆێشتوو کە ئەمە یەکێکە لەڕێگە هەرە کۆنەکانی ئاودێری‌و مەبەست پێکانی (Efficiency) لەچاکترین بارودۆخدا دەگاتە (٦٠٪)، بەڵام بە بەکارهێنانی بۆڕی ئاودێری دڵۆپاندن ڕادەی ئەم مەبەست پێکانە دەگاتە (٩٠٪). بوونی دەریاچەکە چاکترین سەرچاوەیە بۆ بەکارهێنانی ئەم ڕێگەیەی دوایی، ئەویش بەدروست کردنی بەرزە ئەمباراو (Elevatedtank) گواستنەوەی ئاو بۆی بە بەکارهێنانی ترۆمپا ڕاستەوخۆ لەناو دەریاچەکەوە بۆ ناو ئەمباراوەکە. گونجاوی ئەم ڕێگەیە لەوەدایە کە بەکارهێنەر دەتوانی زۆر بەئاسانی لە پلە جیاوازەکانی ئاستی دەریاچەکەوە ئاو هەڵداتە ناو بەرزە ئەمباراوەکە، لەوێشەوە بەهۆی ئەوەی کە ئەمباراوەکە لەشوێنێکی بەرزتر لەکێڵگەکان بنیادنراوە ئاو بەبێ بەکارهێنانی وزە بۆ کێڵگەکان دەگوازرێتەوە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی وردەکارییەکانی ئاودێری‌و دڵۆپاندنی لە بەکارهێنانی قفڵە پەستان کەمکەرەوەکان، دابەشکەرەکان‌و.. هتد.

**٣-بەمەبەستی زیندەکردنی ئاوی ژێر زەوی:-**

...ەو مەبەستە زۆر کاراو چالاك دەبێت ...ەگەر:

- ئەو خاکەی کە دەریاچەکەی لەسەر ...وست دەبێ، خاسیەتی پێدراوێشتنی (Permeability) زۆر بێ بەتایبەتی ...ڕاستەی شاوولی. واتا زیاتر لەچەوو ...ەگل پێك هاتبێت (Conglomerate).
- دەریاچەکە لەسەردەمی کراوەی (Unconfined aquifer) ئەمباراوی ...سنووردار دروست بکرێت.

گرنگی ئەم کارە لەوەدا دەردەکەوێت کە ...ەم پرۆسەیە، تەواو پێچەوانەی ...ەرهەڵکەندنە.

...ەبیرەکان ئەو ئاوە ئەمبارکراوەی ناو ...ەوزەکانی ژێرەوە کە بەگرنگترین سەرچاوەی سروشتی نیشتمانی دادەنرێت ...ە زۆر حاڵەت زۆر بێ بایەخانە هەڵدەکێشرێت و بەفیڕۆ دەچێت، ...ەکاتێکدا ئەو ئاوەی کە ئەگەر بەری ...ێنەگیرێتەوە بێ ئەوەی هیچ سوودێکی ...ێوەربگیرێت بەفیڕۆ دەچێت و تێکەڵ ...ەڕووبارو دواتریش بەدەریا خوێاویەکان ...ەبێتەوە، دەریاچەکە گلی دەداتەوەو ئەگەر خاڵەکانی سەرەوە هاتبوونە دی ...ەشێکی ئەو ئاوە بەرەو ئەمباراوەکانی ژێر زەوی دەنێرێت و دەبێتە هۆی زیاد بوونی ئەو سامانە سروشتیە. هەروەها



دیسان ئەو بڕە ئاوەی کە بەقووڵ دادەچێت دەبێتە هۆی بوژانەوەی سەرچاوە ئاوییەکانی وەك: کانی، بیرە دەستیەکان. لێرەدا گرنگی ئەو پرۆژەیە بەکەم کردنەوەی کاری بیرە قووڵەکان لەسەر وشك کردنی کانیاوەکان دەردەکەوێ.

**٤-بەخێوکردنی ماسی و زیادبوونی باڵندەکان:-**

ئەگەر هاتوو ڕووبەری ڕووکاری دەریاچەکە (١٠٦٥)م٢ بوو، ئەوە ئاوەندێکی زۆر نایاب دروست دەبێ بۆ پەروەردەکردنی ماسی، گەر بەشێوازە زانستیەکانی پەروەردە کردندا بڕوات بەرهەمێکی زۆر چاکی دەبێ. وەك سەرچاوەیەکی گرنگی داهات بۆ خەڵکی ناوچەکە، یان لایەنی دروستکەرو بنیادنەری پرۆژەکە، لەم بارەیەوەش لەزۆر وڵات و ناوچە دروست کردنی پرۆژەکە بەشێوەی بانگری (موساتەحە) دەبێت، کە لەدوای بەکۆتا هاتنی پرۆژەکە بەرهەمی ماسی بۆ ماوەی چەند ساڵ بۆ لایەنی ئەنجامدەری پرۆژەکە دەبێت. کە ئەمەش جۆرێکە لەرێگاکانی جێبەجێ کردنی پرۆژەکان بەتایبەتی لەوڵاتانی سەرمایەداریدا.



لەلایەکی تر بوونی ئەو جۆرە دەریاچەیە دەبێتە هۆی زیادبوون و پەیدا بوونی چەندان جۆری باڵندە کە لەم جۆرە سروشتەدا ژیان دەبەنەسەر، لەکاتێکدا ئەم باڵندانە پێش دروست بوونی دەریاچەکە لەناوچەکەدا بوونیان نییە.

**٥-سود وەرگرتن لەئاوی دەریاچەکە بۆ پێداویستیەکانی ناو ماڵ:-**

دەکرێ سوود لەئاوی دەریاچەکە وەربگیرێ بۆ پێداویستییەکانی ناو ماڵ، ئەویش بەدروست کردنی بەرزە ئەمباراوێك کە ئاستی بەرزتر بێت لەئاستی ئاوابیەکە. بەبەکارهێنانی ترۆمپا ئاو بەرزدەکرێتەوە بۆ ئەمباراوەکە، دوای زیادکردنی کلۆر بۆ خاڵی کردنی لەجۆرەکانی بەکتریا، ئاوەکە ڕەوانەی ماڵەکان دەکرێ بەمەبەستی بەکارهێنانی بۆ پێداویستییەکانی ناو ماڵ، بەڵام لەم حاڵەتەدا وەرگری ئاوەکە (Intake) لەدەریاچەکە دەبێ جۆرە دارشتنێکی تایبەتی بۆ بکرێ، بەمەبەستی هەڵکێشانی ئاوی خاڵی لە پووش و پەلاش و نایلۆن و هەر لەشێکی نامۆ ئەویش بەدروست کردنی وەرگرەکە لەناوەڕاستی دەریاچەکەو سنوردار کردنی بەبێژینگی ئاسن (Trash rack)، ئەمە لەکاتێك ئەگەر ویسترا سودی ڕاستەوخۆ لەئاوە گلدراوەکە وەربگیرێ، بەڵام زۆر جار دەریاچەکە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ سوودێکی زۆری دەبێ بۆ دابین کردنی ئاوی پێویستیەکانی ماڵ، ئەگەر بەنداوەکە لەسەرووی گوند دروست بکرێ، لەو کاتەدا بوونی دەریاچەکە دەبێتە هۆی زیادبوون و گەشانەوەی بیرە دەستیەکان و کانیاوەکانی ناو گوند.

# لیزەر



ئەندازیاری کارەبا :
کامەران عەبدوللا فەقێ موراد

**زانای بەناوبانگ ( جیمس کلارك ماکسویل ) لە سالی ١٨٦٥ز دا سەلماندی کە هەر کاتێك تەزوویەکی کارەبایی گۆڕاو بە سوورە کارەبایەکدا تێپەڕ بێت شە پۆلێکی کارۆموگناتیسی تیشك دەدات و بە خێرایی ( ٣ × ١٠^٨ ) م/چرکە لە بۆشایی بلاو دەبێتەوە.**

ئـەم زانایـە زنجیرەیـەك هاوکێشـەی بیرکاری یانەی لەسەر ئەم باسە دانا لەو هاوکێشانە ئـەوەی بـۆ دەرکـەوت کـە هەریـەك لـە وزەی رووناکیو کارەبـا بەشـێوەی شـەپۆلی کارۆموگناتیسـی لـە بۆشـاییدا بلاودەبێتـەوە وزەی ئـەم شـەپۆلانە بەشێوەیەکی یەکسان بەسـەر هـەردوو بـواره کارەبـاییو موگناتیسییەکەدا کە لەسـەر یـەك ستونن دابـەش دەبێـت. ئاڕاسـتەی هـەر یەکێکیشـیان لەسـەر ئاڕاسـتەی بلاوبوونەوەی شەپۆلەکە ستون دەبێت.

دوایـی ئـەوەش زانـای بـەناوبانگ (هێرتـز) زانایانە ئەو راستییەی سەلماندو بـە تـاقی کردنـەوە دەری خست کـە ئـەم شـەپۆلە کورتانـەی لـە سـووڕێکی کارەبـایی گۆڕاوەوە دەردەچێت هەمان تایبەتمەندی رووناکییان هەیە کە لـە بەیەکدا چوون و جەمسـەرگری و گـەلێك رووداوی دیکـەوە دەردەکەون کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لە زۆر رووی تـرەوە جیاوازییـان هەیـە کـە لـە ئەنجامی جیـاوازی درێـژی شـەپۆلەکانیان رەچاو دەکرێت.

هـەروەها بـە تـەواویش سـەلماندی کـە رووناکی سروشتی کارومۆگناتیسی هەیە.

شـەپۆلە کارۆموگناتیسـییەکان بـۆ حـەوت ناوچەی سەرەکی دابەش دەکرێت و هـەر ناوچـەیەکیش لەگـەڵ هـەردوو ناوچـەکانی ئـەم لاو ئـەولای‌دا بـە یەکـدا دەچـن کـە ئەمانەن:—

١)شەپۆلە رادیۆییەکان.
٢)شەپۆلە مایکرۆی یەکان.
٣)شەپۆلە خوار سوورەکان.
٤)شەپۆلە رووناکی بینراو.
٥)شەپۆلە سەر وەنەوشەییەکان.
٦)تیشکی ئێکس.
٧)تیشکی گاما.

لێـرەدا تـەنها باسـی بەشـی رووناکی شەبەنگی کارۆموگناتیسی دەکەین لەبـەر ئەوەی مەبەست لە (لیزەر) بە تین کردنـی رووناکییـە بـە بـەکارهێنانی تیشـکدان بـە بزواندن.

لە سالی (١٩٥٤)ز زانای بەناوبانگ (تاونز) تـوانی ئـەو بیرۆکەیـە بێنێتـە دی کـە ئەنیشتاین لەسالی ١٩١٧ بـلاوی کردبـۆوە توانیـان یەکـەم دەزگـای مـەیزەر دروست بکەن بـۆ بـەتین کردنـی تیشـکێك بـەکاری بهێنین کە لەرەلەرەکەی (٢٣,٨٧ * ١٠^٦) لـەرە/چـرکە بێـت و درێـژی شـەپۆلەکەش ١,٢٥سم بێت بۆ ئەم مەبەستەش ئامۆنیا وەك ناوەندێکی چالاك لـە دەزگاکەیانـدا بـەکارهێناو وشـەی مـەیـزەر لـە (Micro wave Amplification by Stimulated Emission of Radiation)

واتە بە تین کردنـی شـەپۆلە مایکرۆیـەکان بەبەکارهێنانی تیشکدان بە بزواندن.

بـەکارهێنانی مـەیزەر بـۆ دروسـتکردنی لەرەلـەرەی شـەپۆلی مـایکرۆی بـە چوستییەکی بەرز ڕێ خۆشکەری گەلێ لـە زاناکان بوو ب ۆ بـە تـین کـردن و بەرهـەم هێنانی رووناکی و دروستکردنی دەزگـای لەیزەرو ووشەی لیزەریش لە (Light Amplification by stimulated Emission of Radiation)

واتە بەتین کردنی رووناکی بە بەکارهێنانی تیشکدان بە بزواندن.

لە ساڵی ١٩٥٨ زانای فیزیایی ئەمریکی (تاونز) دەزگایەکی لەیزەری داهێنا، بەڵام لە کردار بەکاری نەهێنا چونکە نەیتوانی ئەو ماددە چالاکە یان ئەو ناوەندە چالاکەی تیا دابنێ کە بۆ بەرهەم هێنانی تیشکی لەیزەر پێویستە، دوایی ئەوە لە ساڵی ١٩٦٠ زانای بەناوبانگ (مایمان) توانی دوایی چەند رۆژێك تاقیکردنەوەی تاونزی بێنێتە دی و یەکەم شەپۆلی لەیزەری رووناکی بهێنێتە بەرهەم و پێی دەووترێ لەیزەری دۆخی رەقی چونکە ناوەندە چالاکەکەی ماددەیەکی رەق بوو.
لە ساڵی ١٩٦١ زانا (علی جافان) توانی یەکەم لیزەری گازی بەرهەم بێنی و پێی دەووترێ لێزەری هیلیوم - نیون و لە ساڵی ١٩٦٢ لەیزەری شلەکان دۆزرایەوە دوایی ئەویش لیزەری کیمیاوییەکان و ئێستاش زاناکان خەریکی بەرهەم هێنانی لیزەرێکی نوێن پێی دەووترێ ( No vette) ئەم لیزەرە توانای گەرم کردنی ماددەکانی هەیە تا پلەی گەرمی ناو جەرگەی خۆر کە دەگاتە ملیونەها پلەی سەدی.

بە مەبەستی بە دەست کەوتن و بەرهەم هێنانی تیشکی لیزەر ئەوا پێویستمان بەم خاڵانەی خوارەوە هەیە.

## سەر چاوەی وزە پێدان

أ. وزە پێدانی رووناکی.



ب.خاڵی بوونەوەی کارەبایی.

ج.وزەی کیمیایی پێدان.

د. گواستنەوەی بزواندن.

٢) ناوەندی چالاك

أ.لیزەری دۆخی رەقی.

ب.لیزەری نیمچە گەیەنەرەکان.

ج.لیزەری دۆخی شلی.

د.لیزەری دۆخی گازی.

ه.لیزەری کیمیاییەکان.

٣)زرنگێنە

یەکێك لە مەرجەکانی بەتین کردنی



رووناکی د روستکردنی دەزگایەکی تایبەتییە وا لە فۆتۆنە دەرچووەکان بکات چەندەها جار بەناو ئەتۆمەکانی ماددە بزوێنراوەکان بێن و بچن تا دەیان بزوێنن و وایان لێ دەکەن وزە تیشك بدەن. بەو دەزگا پێویستە دەووترێت زرنگێنە.

## تایبەتمەندیەکانی تیشکی لەیزەر

لە راستیدا تیشکی لەیزەر شەپۆلێکی کارۆموگناتیسییە هیچ جیاوازێکی بنەرەتی نییە لەگەڵ ئەو ش ەپۆلانەی لەسەرچاوە ئاساییەکانەوە دەردەچێ، بەڵام ئەم چەند تایبەتمەندییە سەرەکییەی هەیە.



١-تیشکی لەیزەر هاوبارە لە شوێندا و لەکاتیشدا.

٢- گۆشە بڵاوبوونەوەکەی یەکجار بچووکە.

٣-تاك لەرەلەرە و توندی زۆرە.

## بەکارهێنانی تیشکی لەیزەر

١-بەکارهێنانی تیشکی لەیزەر لەبواری پزیشکی.

٢-بەکارهێنانی تیشکی لەیزەر لەبواری پیشەسازی:

أ. لکاندن

ب. برینەوە

ج. سمین

٣- بەرکارهێنانی تیشکی لەیزەر بۆ پێوانی دووری.

٤-بەکارهێنانی تیشکی لەیزەر لەبواری وێنەی بەرجەستە (Holography).

٥-بەکارهێنانی تیشکی لەیزەر بۆ مەبەستە سەربازیەکان.

٦-بەکارهێنانی تیشکی لەیزەر بۆ گەیاندن (اتصالات).

٧-بەکارهێنانی تیشکی لەیزەر بۆ گواستنەوەی وزە (لەژێر تاقیکردنەوە دایە).



# ڕێگای دروست بۆ جێگیر کردنی سیستەمی جوولاو

ئەندازیار/ عەبدولڕەحمان بەهائەددین

**گومانی تێدا نییە کە گرینگترین بوار شۆڕشی جیهانگیری تێدا ڕوویدا بێت بواری وەرگرتنو ناردنو ئاڵوگۆڕکردنی زانیاریە هەمەجۆرەکانە کە بەهۆی ئامێرەکانی ناردنو وەرگرتن ڕوودەدات.**

یەکێك لەگرنگترین مەرجەکانی ناردنو وەرگرتن دروست دانانی سینی ناردنو وەرگرتنە کە پێویستە بەڕاسترین گۆشە بەرامبەر مانگی دەستکرد دابنرێت، چونکە پێویستە ئەو سینییە بەگۆشەیەکی دیاریکراو سەیری ئەو مانگەدەستکردە بکات لەبەرئەوەی هەر گۆڕانێکی بچووکی ئەم گۆشەیە لەسەر ڕووی زەوی تا دەگاتە ئەم مانگە دەستکردە بڕەکەی گەلێك زیاتردەبێت، جا ئەو مانگە دەستکردانە بە مەبەستی (گەیاندن یا تەلەفزیۆن یا کەشناسی یا بۆ ئینتەرنێتو هتد...) بەکاربهێنرێت، ئەو مانگە دەستکردانە لەدەوری گۆی زەویدا دەخولێنەوە بەئاراستەی خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆیداو بەخێرایی ١١٠٧٢کم\سەعات ئەم خێراییەش بەگوێرەی دووری ئەو مانگە دەستکردە دانراوە لەگەڵ زەوی، کە مانگەدەستکردەکان ٣٥٨٠٠کم بەرزترن لەهێڵی ئیستوای ڕووی زەوی.



وێنەی (١)

مانگەدەستکردەکان لەسەر چێوەیەکی ٣٦٠°پلەیی لەسەر خولگەی هاوکات (Synchronous Orbit) لەگەڵ زەوی دا دەخولێنەوە کە بەچاوی ئاسایی نابینرێن.

بەرچاوترین سیستەمی میکانیکی ئامێرەکانی ناردنو وەرگرتن سینیو میکانیزمی جوولاندنی ئەو سینییە بۆ وەرگرتنو ناردن، هەر سینییەك دەتوانێت (١٨٠°پلە) مانگەدەستکردەکان ببینێت ئەمەش لەبەر هۆکاری گۆیی زەمین.

بەڵام لەپراکتیکدا گۆشەی (١٨٠°پلە) نایەتە جێبەجێکردن (بینین) چونکە ناتوانین پلەی (سفر) بەدەست بهێنین لەبەر هۆکاری بوونی بەربەستی ماددی

خشتەی ژمارە - ١ -

| شار | نزیکترین مانگ لەناوەڕاستیەتی | بواری بینین |
|---|---|---|
| مسقط | ئینتلسات ٩٠٤ (٦٠ ڕۆژهەڵات) | لە ١٥ ڕۆژهەڵات بۆ ١٢٨ ڕۆژئاوا |
| دبی | ئینتلسات ٧٠٣ (٥٧ ڕۆژهەڵات) | لە ١٨ ڕۆژهەڵات بۆ ١٢٨ ڕۆژئاوا |
| دوحة ، کویت | ئەکسپرێس ٢٢ (٥٣ ڕۆژهەڵات) | لە ٢٢ ڕۆژهەڵات بۆ ١٢٠ ڕۆژئاوا |
| بحرین ، دمام | ئەکسپرێس ٢٢ (٥٣ ڕۆژهەڵات) | لە ٢٢ ڕۆژهەڵات بۆ ١٢٠ ڕۆژئاوا |
| بغداد | یوروپا ستار (٤٥ ڕۆژهەڵات) | لە ٢٧ ڕۆژهەڵات بۆ ١١٣ ڕۆژئاوا |
| ریاض ، صنعاء | یوروپا ستار (٤٥ ڕۆژهەڵات) | لە ٢٧ ڕۆژهەڵات بۆ ١١٣ ڕۆژئاوا |
| دمشق ، بیروت | سی سات (٣٦ ڕۆژهەڵات) | لە ٢٧ ڕۆژهەڵات بۆ ١٠٥ ڕۆژئاوا |
| خرطوم ، قاهرة | عەرەبسات ٢ (٣٠.٥ ڕۆژهەڵات) | لە ٣٤ ڕۆژهەڵات بۆ ١٠٥ ڕۆژئاوا |
| تونس ، جزائر | یوتێلسات (١٠ ڕۆژهەڵات) | لە ٦٣ ڕۆژهەڵات بۆ ٨٠ ڕۆژئاوا |
| الرباط | نایل سات (٧ ڕۆژئاوا) | لە ١٠٠ ڕۆژهەڵات بۆ ٦٤ ڕۆژئاوا |



وێنەی (٢)

لەنێوان سینییەکەو مانگەکە کەواتە گۆشەی سەرەکی یا بڵێین گۆشەی بینین برەکەی کەم دەبێتەوە لە (١٨٠°پلە) بۆ (١٧٠°پلە).

بەپێی ڕێنماییەکانی کارکردن گۆشەی سەرەکی بینین نابێت لە (٥°پلە) کەمتربێت بۆ ئەوەی ڕێژەی ژاوەژاوەی گەرمی (ضوضاء الحراري) زیادنەبێت کە سینییەکە وەریدەگرێت پاش دانەوەی لەڕووی زەوی، هەروەها بۆ ئەوەی نەکەوێتە سەر لێواری چەمانەوەی سینییەکە (لەبەر ئەوەی سینییەکە نیمچە قۆپاوە) لەژێر کاریگەری کێشدا. بۆیە وایپێویست دەکات لەگۆشەی سەرەکی بینین لەلای ڕۆژهەڵاتەوە یان لەلای ڕۆژئاوا بەبڕی (١٠°پلە) کەم بکرێتەوە بەجۆرێك جوولەی چەمسەری بازنەیی لەئاسۆی ڕۆژهەڵات بۆ ئاسۆی ڕۆژئاوا دەبێت بەگۆشەی (١٦٠°پلە) لەجیاتی (١٧٠°پلە). (ئەو باسەی تا ئێستا لەگۆشەی سەرەکی بینین کرا بەشێوەیەکی تیۆری بوو).

بەلام لەپراکتیکدا هیچ سیستەمیکی میکانیکی نەیتوانیوە ئەو بوارەی جوولە بەدەست بهێنێت،کەتائێستا توانراوە بواری گۆشەی (١٣٠°پلە) لەئاسۆی ڕۆژهەڵات بۆ ئاسۆی ڕۆژئاوا دابین بکرێت، ئەو میکانیزمەش بەبەکارهێنانی سیستەمی Horizon-To-Horizon یا بەکورتر H-H واتا ئاسۆ بۆ ئاسۆ دێتەدی و کەمبوونەوەی ئەم بوارە بۆ (١٠٠°پلە) لەڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا کاتێك ئەو باسکەی بەکاریدەهێنین بۆ جوولاندنی سینییەکە درێژی یەکەی (٣٦ ئینج) بێت، بەلام گەر هاتوو درێژی باسکەکە کەم بکەینەوە بۆ (٢٤ ئینج) ئەوا گۆشەی سەرەکی بینین نرخەکەی کەمتر دەبێتەوە بۆ (٨٠°پلە)، لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە گۆشەی سەرەکی بینین ڕاستەوانە دەگۆڕێت لەگەڵ درێژی باسکی جوولێنەری سینی.

لەکاتی بەستنی باسکەکە لەسینییەکە گەر لەلای ڕاستی سینیەکە ببەسترێت جیاوازە لەوەی کە لەلای چەپی سینییەکە ببەسترێت، لەبەرئەوەی جیاوازی لەبینینی گۆشەی سەرەکی دروست دەبێت لەلای ڕۆژهەڵات و لای ڕۆژئاوای سینییەکە هەروەك لەوێنەی ژمارە(١) دیارە. ئەگەر هاتوو باسکەکە لەلای چەپی سینییەکە بەسترابێت‌و درێژی باسکی جوولێنەر (٣٦ ئینج)و سینییەکە بسوڕێنین بۆ نموونە گەر (٨٠°پلە) بسوڕێت ئەوا بواری نێوان مانگی ئاسیا سات ٢ (گۆشەی ١٠٠,٥° ڕۆژهەڵات) بۆ مانگی ئاسترا 1G/1H (گۆشەی ١٩,٢° ڕۆژهەڵات) وەردەگرێت، بەلام ئەگەر هاتوو هەمان سینی‌و هەمان باسك بەکاربهێنین لەشوێنی ئەوەی باسکەکە لەلای چەپ ببەسترێت لەلای ڕاست ببەسترێن ئەوا بەهەمان سووڕاندن لەسەر باسکەکە بواری نێوان مانگی هیسپاسات (٣٠° ڕۆژئاوا) بۆ ئێکسپرێس AM22 (٥٣° ڕۆژهەلات) وەردەگرێت، لەئەنجامدا بۆمان دەردەکەوێت کە سینییەك هەرچەندە مانگەکانی ڕۆژهەلات وەربگرێت ئەوا لەوەرگرتنی مانگە ڕۆژئاواییەکان کەم دەبێتەوە.

## سینییە ڕووەو باکورەکان و ڕووەو باشورەکان

هەروەك لەپێشتر باس کرا کە مانگەدەستکردەکان لە خولگەیەکی هاوکات (Synchronous Orbit) لەگەڵ زەویدا دەخولێنەوە بەئاراستەی خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا بەرامبەر هێڵی ئیستیوا، جا ئەو سینیانەی کە لەوڵاتانی سەرووی هێڵی ئیستوادان (لەنێوان هێڵی ئیستواو بەستەڵەکی باکوور) ئەوانیش (وڵاتانی کیشوەری ئەوروپاو باکووری ئاسیاو باکووری ئەفریقیاو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست‌و کەنداوی عەرەب‌و کوردستان‌و عێراق‌و سوودان‌و هتد...) دەبێت سەیری باشوور بکەن،

خشتەی ژمارە -٢-

| گۆشەی مێلی پانی | لارگۆشە | گۆشەی مێلی پانی | لارگۆشە | گۆشەی مێلی پانی | لارگۆشە |
|---|---|---|---|---|---|
| 5 | 0.89 | 25 | 4.23 | 45 | 6.81 |
| 6 | 1.06 | 26 | 4.34 | 46 | 6.92 |
| 7 | 1.24 | 27 | 4.53 | 47 | 7.01 |
| 8 | 1.41 | 28 | 4.67 | 48 | 7.11 |
| 9 | 1.59 | 29 | 4.82 | 49 | 7.21 |
| 10 | 1.76 | 30 | 4.96 | 50 | 7.3 |
| 11 | 1.94 | 31 | 5.1 | 51 | 7.38 |
| 12 | 2.11 | 32 | 5.24 | 52 | 7.47 |
| 13 | 2.28 | 33 | 5.38 | 53 | 7.55 |
| 14 | 2.45 | 34 | 5.51 | 54 | 7.63 |
| 15 | 2.62 | 35 | 5.64 | 55 | 7.71 |
| 16 | 2.79 | 36 | 5.77 | 56 | 7.78 |
| 17 | 2.95 | 37 | 5.9 | 57 | 7.85 |
| 18 | 3.12 | 38 | 6.02 | 58 | 7.92 |
| 19 | 3.28 | 39 | 6.14 | 59 | 7.99 |
| 20 | 3.44 | 40 | 6.26 | 60 | 8.05 |
| 21 | 3.6 | 41 | 6.38 | 61 | 8.11 |
| 22 | 3.76 | 42 | 6.49 | 62 | 8.16 |
| 23 | 3.92 | 43 | 6.6 | 63 | 8.22 |
| 24 | 4.07 | 44 | 6.71 | 64 | 8.27 |



وێنەی (٣)

بەڵام ئەو سینیانەی کە لەوڵاتانی خواروی هێڵی ئیستوادان (لەنێوان هێڵی ئیستواو بەستەڵەکی باشوور) ئەوانیش (وڵاتانی ئوسترالیاو ئەندونیسیاو کاریبیو ئەمریکای باشوور لەئیکوادورەوە بۆ ئەرجەنتین‌و لەئەفریقیاش لە وڵاتی چادەوە بۆ وڵاتی باشووری ئەفریقیا) دەبێت سەیری ناوچەی باکوور بکەن).

لە هەر پۆتانێکی سەر ڕووی زەمینەدا جۆرە بوارێکی وەرگرتنی مانگەکانی هەیەو باشترین بواری وەرگرتن ئەو بوارەیە کە سینییەکە لەناوەڕاستی گۆشەی وەرگرتن دابێت. گرنگی گۆشەی ناوەڕاستیش لەوەدایە کە سوودی لێدەبینرێت لەکاتی جێگیرکردن‌و دانانی سیستەمی جوولاو. لەکاتێکدا گۆشەی ئاسۆیی دوورترین مانگ کە سینییەکە دەیبینێت لەڕۆژهەڵات یان لەڕۆژئاوا گۆشەی سەرەکی وەرگرتن بەپێی پۆتانی ئەو شوێنەیە لەسەرگۆی زەوی هەروەک لەخشتەی ژمارە (١) کە هەندێ جێبەجێ کردنی کرداری مانگی ناوەڕاست و گۆشەی سەرەکی بەدیاردەکەوێت، وێنەی ژمارە (٢) ئاماژەدەری زیاتری بابەتەکانە.

**تایبەتمەندییەکان وجێگیربوونی (جوولەی جەمسەری لە وەرگرتنی سینییەکاندا):**

بڵاوترین پراکتیکی وەرگرتن لەجیهاندا بەکارهێنانی ئەو سینی‌یەیە کە لەدەوری تەوەرەی جەمسەری Polar Axis (ناسراو بە تەوەرەی بارکردن، یان تەوەرەی سووڕان) دەخولێتەوە، لەبەر ئەوەی دروست کردنەکەی ئابوورییەو دیزاینی سادەیەو پێکهاتەی ئاسانە.

لە تایبەتمەندییەکانی سینی دوو جۆرە جوولەی هەیە ئەوانیش ئاسۆیی‌و ستوونییە، هەردوو جوولەش بەدەوری تەوەرەی بارکردندا دەبێت بەجۆرێك بڕی وەرگرتنی مانگەکان لە هەردوو کۆتاییدا (ڕۆژهەڵات‌و لەڕۆژئاوای سینییەکە) دەگاتە کەمترین بڕو لە ناوەڕاستیشیدا زۆرترین بڕ وەدەست دەهێنێت.

بیرۆکەی سووڕانی سینی لەدەوری تەوەرەی جەمسەریدا لە وێستگەکانی نیشانەی ئەستێرەکان‌و بۆشایی ئاسمان لەبواری فەلەکدا وەرگێراوە.

بەڵام لەبەربوونی جیاوازی دووری لەنێوان زەوی‌و ئەستێرەکان لەلایەك‌و لەنێوان زەوی‌و مانگەدەستکردەکان لەلایەکی تر لێرەدا پێویست دەکات گۆڕانکاریەکی کەم هەبێت لەسیستەمی میکانیکیدا بەزیادبوونی لاری سینییەکە کە لەئەنجامدا لارە گۆشە دروست دەبێت (Declination Angle) هەروەك لەوێنەی ژمارە (٣)دا دیارە، ئەو لاریەش بۆ خولگەی هاوکاتی مانگە دەستکردەکان دەگەڕێتەوە کە ئەو لاریە نییە لەکاتی بینینی خولگەی ئەستێرەکان هەر لەبەرئەوەشە بینینی ئەستێرەکان پێویستی بەلارە گۆشە نییە، بەبێ بوونی گۆشەی لار ئەوا ئەو سینییە ڕووەو خولگەی هاوکات ناڕوات بەڵکو ڕووەو بۆشایی ئاسمانە هەروەك لەوێنەی ژمارە (٤) دیارە، بەڵام بەبوونی لارە گۆشە هەر وەك لەوێنەی ژمارە (٥)دا دیارە وەرگرتن‌و ناردنی سیگناڵ signal ڕوودەدات.



وێنەی (٤)

ئەم لارە گۆشەیەش ( Declination Angle) لەهەر پۆتانێکی سەر ڕووی زەویدا بەهایێکی تایبەتی خۆی هەیە واتا لەهەر هێڵێکی پانی شوێنی جوگرافیدا کە سینی وەرگرتن‌و ناردنی تێدا دانرابێت برێکی تایبەتی هەیە بەجۆرێك لەسەر هێڵی ئیستوا دا بەهای (سفر)دەبێت‌و ئەگەر بەرەو جەمسەری باکوورو یان بەرەو جەمسەری باشوور بڕۆین زیاد دەبێت، بەڵام ئەوەشمان لەیاد نەچێت گەورەترین پێوانە کە لارە گۆشە بیگاتێ نابێت لە ($10^{\circ}$ پلە) تێپەڕبێت. هەر وەك لەخشتەی ژمارە (٢)دا بەدیار کەوتووە کە لە هەر شوێنێکی هێڵی پانی بەهایێکی تایبەتی هەیە. ■



وێنەی (٥)

# بەردی بناغەی تاوەری ئازادی لەجێگای دوو تەلارە رووخاوەکەی نیویۆرکدا

ئەندازیار



**بیست تۆن لە گرانێتی چیاکانی دیرۆنداکی سەرووی شاری نیویۆرکی ئەمریکی، کەرەستەی ئەو بەردی بناغەیەیە کە بۆ تاوەرێ دادەنرێت کە بڕیارە لە جێگای دوو تاوەرەکەی ( World Trade Center) رووخێنراو دروست بکرێت، ئەمەش سەرەتای دەستپێکی ئەو پلانە پێنج ساڵانەیەیە کە بۆ دروستکردنی تەلارێکی هەوربڕی ( ١٧٧٦ ) پێ بەرز، داڕێژراوە کە دەبێتە نیشانەیەکی شکۆداری ئاسمانی شاری نیویۆرك.**

ئەم باڵەخانەیە کە بەتاوەری ئازادی ناوزەد کرا لەلایەن بەرپرسە ئەمریکیەکان بەچاوێکی گەش و پڕ لەهیواوە تێی دەڕوانرێت. پارێزگاری نیویۆرك جۆرج پاتاکی بەم بۆنەیەوە گوتی: ((چ رۆژێك لەم رۆژە خۆشترە بۆ ئەمریکیەکان لەدانانی بەردی بناغەی تاوەری ئازادی مەگەر تەنها ئەو رۆژە بێت کە ئەمریکا سەربەخۆیی تیا وەرگرت. هەروەها گوتی هەموو کەس ئەوە دەزانن کە ئەم تاوەرە لەوە زیاترە کە تەنها باڵەخانەیەك بێت و بەس، بەڵکو ئەوە هێمای ئازادی ئەمریکایەو هێمای نوێ بوونەوەمانە)).

شایەنی باسە زۆر لەسەرچاوەکان ئەوە دەگەیەنن کە ئەم تاوەرە بەرزترین تاوەرە لەدنیادا. کەچی بۆ چوونی جۆراوجۆر هەیە بۆ پێناسە کردنی بڵندترین باڵەخانە لەجیهاندا:-

**ئایا ئالێری ئەنتێن یان تاوەری سەر باڵەخانەکەش بۆ بەرزی پێوانە دەکرێت یان نەء؟**

چونکە هەندێك باڵەخانە بەدرێژترین دادەنرێت بە رەچاوکردنی یەکێك لەپێوەرەکان نەك هەمووی.

تاوەری ئازادی جگە لەبەرزی تەلارەکە کە (١٧٧٦) پێیە، ئەوا ئالێرێکی ئەنتێنی پەخشی لەسەر دەبێت کە بەرزییەکەی (٢٧٦) پێیە، بەمەش بەرزی تاوەری ئازادی لە (٢٠٠٠) پێ تێ دەپەڕێت.

لەرووی بەراوورد کردنەوە: بیترۆنس تاوەر لە کوالالمبور لەمالیزیا (١٤٨٣) پێیە بەرزترین تاوەر بوو لەجیهاندا تاکو پار بەتاوەری تایپی ١٠١ بەبەرزی (١٦٧٤) پێ، بەجێهێڵدرا گەرچی تاوەری (CN) لەشاری تۆرنتۆی کەندی بەرزییەکەی (١٨٨٥) پێیە، کە کەندیەکان بە بەرزترین باڵەخانەی دادەنێن لەجیهاندا، کەچی یەك ناگرێتەوە لەگەڵ بۆچوونی زۆر لەپسپۆڕەکانی بواری بیناسازی کە تەنها بەتاوەری دادەنێن نەك باڵەخانە.

دوو تاوەرەکەی ناوەندی بازرگانی جیهانی (World Trade Center)، (١٣٦٠) پێ بەرز بوون کە بە بەرزترین دوو باڵەخانە بوون لەجیهاندا کاتی تەواو بوون لەساڵی (١٩٧٢-١٩٧٣)، بەڵام هەر ساڵێك دوای ئەوە بەتاوەری سیرز لە شیکاگۆ بە بەرزی (١٤٥٠) پێ جێهێڵدرا، تاوەری ئازادی کە سەرەکیترین باڵەخانەی هەوربڕ دەبێت (Sky Scraper) لەلایەن نەخشەسازی بیناسازی دیڤید چایلدز نەخشەی بۆ کێشراوەو پلانی گشتی و سایتەکەشی لەلایەن دانێل لیبەسکین ئەنجام دراوە.

تاوەرەکە کۆنکریتی دەبێت کە بەتۆرێکی کێبلی ستیل (ئاسن) بەهێز دەکرێت، کە نەخشەسازی بیناسازی چایلدز تۆڕی کێبڵەکانی بەشێوەیەك داناوە وەکو ئەوەی لە پردە هەڵواسراوەکان (Suspension Bridge) بەکار دەهێنرێت. تاوەرەکە جۆرەها تەکنیکی نوێ تیایدا بەکار دەهێنرێت و چەند تۆربایینێکی بای دەبێت کە دەتوانێت ٢٠٪ی وزەی پێویست بۆ باڵەخانەکە ئامادە بکات، هەروەها شێوازی هاتووچۆی بەچەشنێك تیادا رێکخراوە کە بەرگەی هاتووچۆی قەڵەباڵغ بگرێت بوودجەی پرۆژەکەش (١,٥) ملیارێك و نیو دۆلارە.

پەیکەری ئاسنی تاوەرەکە بڕیارە لە ٢٠٠٦ تەواو بێت، بەجۆرێك کە باڵەخانەکە لەساڵی ٢٠٠٨ ئامادە دەبێت بۆ نیشتەجێ بوون.

ئەم تاوەرە یادگاری لەناوچوونی (٢٧٤٩) کەسە کە لەرووداوی ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١دا تێچوون. هەروەها ئەو ٦ کەسە لەرووداوی تەقینەوەی ئۆتۆمۆبیلێکی مین رێژدا لەهەمان باڵەخانەی WTC لەساڵی ١٩٨٦ گیانیان لەدەستدا.



لە ماڵپەڕی (CNN) وەرگیراوە

# جیهانی ئاینده

ئەندازیار / ئەزهەر کەریم محەممەد



**بێگومان تەکنەلۆجیا یەکێکە لە هەرە خێراترین زانستەکانی سەردەم. کە لە هەر چرکە ساتێك گۆڕانکارییەکی نوێی تێدا ئەنجام دەدرێت. بۆیە لامان سەیر نەبێت هەر کاتێك هەواڵی سەیر لەسەر ئەندازەکانی جیهان رووبدات. بەهەر حاڵ ئەوانەی کە لەخوارەوە باس دەکرێن مشتێکن لەزانستو تەکنەلۆجیای سەدەی بیستو یەکو لەساڵەکانی داهاتوودا زانست هەگبەی خێراترو فرەجۆرتر دەبێت لە پێشکەوتن و دەستکەوتەکانی.**

**رۆبـــۆت:-**

رۆبوت پێك دێت لەسیستەمی ئـەلکترۆنیو ئـامێری زۆر هەسـتیار کـە دەتوانرێـت بەرنامەسازی بکرێت بۆ کاری دیاری کراو، دەتوانرێت بەشەکانو سیستەمی رۆبۆت



لەگەڵ لەشی مرۆڤدا بەراورد بکرێت، بۆ نموونە گوێو دەنگی مرۆڤ بەرامبەر بڵندگۆ دەنگییەکانی رۆبوت کە شەپۆلە دەنگییەکان دەبنە تریەی کارەبایی، هەروەها خانەی کارو رووناکی یان کامێرای تەلەفزیۆنی ورد شەپۆلی رووناکی دەکاتە تریەی کارەبایی. رۆبۆتی داهاتوو توانای کاری زۆر وردو هەستیاری هەیە وەکو وەرگرتنی نموونەی خۆڵ لەسەر هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر یان ناسینی مۆکارە تیشکییەکان لەنێو کارلێکە ناووکییەکان، یاخود کاری برین پێچی دڵ یان مێشك.

**کۆمپیوتەری دوارۆژ:-**



کارکردنی زانایان بۆ هێنانەدی کۆمپیوتەری دوارۆژ سنووری نییە. ئەوان لەهەوڵی ئەوەدان کۆمپیوتەرێکی قەبارە بچووکو کێش سووك دروست بکەن کە بتوانرێت بەئاسانی هەڵبگیرێت بۆ هەر شوێنێك بێت. بەشێوەیەك شاشەیەکی بەلووری شلی هەبێت. هەموو زانیارییەکانی تیادا روونبکرێتەوە کە بتوانرێت بەدەستی راست یا چەپ کاری پێ بکرێتو بەرنامە ساز بکرێت بەهۆی دەنگی مرۆڤو هەر بەهەمان دەنگیش داوای بەرنامەکانی لێ بکرێت نەك بەدەنگێکی تر. هەروەها ئەم کۆمپیوتەرە توانایەکی بێ شوماری لەکۆکردنەوەو گەڕاندنەوەی زانیاری هەیە لەچاوتروکانێکدا ئەمەش بەهۆی (کیپ سێت) توێژاڵی ئەلیکترۆنی پێشکەوتوو.

**خانووی دوارۆژ:-**

زاناکان پێشبینی خانووی دوارۆژ دەکەن لەسەر ئاوو لەناوەڕاستی زەریاکاندا دروست بکرێت. بەشێوەیەك ئەم خانووانە پاشکۆی وێستگەی کارەبایو سووتەمەنی هەبێت. دانیشتوانیشی لەکارگەکان کاربکەن کە بەهەمان شێوە لەسەر رووی زەریاکان

دروست دەكرێت بۆ جێبەجێ كردنی پێداویستیەكانی ئەم خانووانە. شوشەش بریتی دەبێت لەكەرەستەی سەرەكی خانووەكانی دوارۆژ بۆ تێپەڕبوونی زۆرترین رادەی تیشكی رۆژ بۆ سوود لێوەرگرتنی بۆ وزە.

**نیشتەجێ بوون لەسەر مەریخ:-**



زاناكان پێشبینی دەكەن بۆ گەیشتن بۆ سەر هەسارەی مەریخو نیشتەجێ بوون تیایدا لەشوێنی داخراوی دابین كراو بەئۆكسجینو پلەی گەرمی گونجاو. لەگەڵ ئەمەشدا لەسەر هەسارەكە بەدوای كانزای بەنرخ دەگەڕێن بۆ گواستنەوەی بۆ سەر هەسارەی زەوی. سەرەڕای چاودێری كردنی هەسارە نزیكەكانی مەریخ بۆ زیاتر شارەزابوون لەكۆمەڵەی خۆر. كە ئەم نشینگەیانەش لەئەلەمنیۆمو شوشەی تۆكمە دروست دەكرێن.

**كارگە لەسەر مانگ:-**

ئێمە كە لەسەرەتایی سەدەی بیستو یەك دەژین، ئەوەی كە لەو ماوەیەدا بەدەست هێنراوە دەتوانێت بمانگەیەنێتە پێشبینییەكی زانستی بۆ بەدەست هێنراوەكانی دوارۆژ، زاناكانیش گەشبینن بۆ زاڵ بوون بەسەر گشت ئەو كێشانەی كە ئێستا بەدەستیانەوە دەناڵێنن



پێشبینییەكانیشیان لەسەر بنچینەیەكی زانستی بنیادەكەن، ئەوان دەیانەوێ سوود لەكەمی تاودانی مانگ وەربگرن بۆ دروست كردنی كارگە لەسەر ڕووی مانگ، ئەمەش بۆ دروست كردنی بەرهەمی جۆری باشتر لەوەی كە لەسەر ڕووی زەوی بەرهەم دەهێنرێت، وەك توێژاڵی (رقاقات) ئەلكترۆنی بۆ كۆمپیوتەرو بلووری دەرمانەكان.

**شارێك لەژێر دەریا:-**

هەموو شتێك لەجیهانی دوارۆژدا بۆ خۆشگوزەرانی مرۆڤ دروست دەكرێت. وەك ئەو شارە دوارۆژییەی كە لەژێر دەریا دروست كراوە. بۆ بەسەر بردنی كاتی خۆشو تەماشاكردنی دیمەنە سەرنج ڕاكێشەكانی نێو قوڵایی دەریا، ئەو شارەش لەخانووی هاوشێوەی چەتر پێك دێت كە لەئاسنی پۆڵا دروست دەكرێت، هەمووشی بەچەقێكی سەرەكی بەستراوەتەوە كە دابینی دەكات بە وزەو ئۆكسجین، لە هەر خانوویەكیش كونی گەورەی پلاستیكی دیوەدەر (شەفاف)ی هەیە بۆ تەماشاكردنی دیمەنەكانی دەریا كە بە تۆڕەكانی شوشەیی داپۆشراوە.

**كامێرای ڤیدیۆی دوارۆژ:-**

زاناكانی ئەم چەرخە خەریكی دروست كرنی ئامێرێكی كامێرای ڤیدیۆی زۆر سەیرو سەمەرەن كە هەر كەسێك دەتوانێت لەبەری بكات! بەشێوەیەك بریتییە لەتۆپێكی سپی كە كونێكی ڕەشی تێدایە بە لولەیەك بەستراوەتەوە لە مل تا ناوەڕاستی لەش درێژ دەبێتەوە، لەسەرەوەی لای ڕاست شاشەیەكی چاودێری هەیە كە ئامێرێكی تۆماركەری پێ بەستراوەتەوە لەگەڵ ئاوێنەیەكی چاوی كە بۆ ئاراستە كردنی كامێرا بەكاردێ بۆ دیمەنی بەمەبەست گیراو. هەرچی ئامێری كارپێكردنو كوژاندنەوەی كامێراشە لەلای چەپی لەش دانراوە كە بەپەنجە داگرتن كاردەكات.

**ئۆتۆمبیلی دوارۆژ:-**

ئەوەیان وەكو شۆڕشێكە لەبواری هۆیەكانی گواستنەوە لەنێو شارەكاندا. كە جیهان چاوەڕێی دەكات بۆ نەهێشتنی قەرەباڵغیو پیس بوونی ژینگەو وەستانی ئۆتۆمبێلەكان لەشوێنی چاوەڕێ كردن. ئەمەش بەهۆی ئەو ئۆتۆمبیلە نوێیەی كە نهێنییەكەی لەوەدایە بەنەخشەسازییەكی بێ وێنە دروست دەكرێت كە دەتوانرێت لاشەو مەكینەكەی لەگەڵ بەشەكانی تر جیاواز بكرێتەوە، بیرۆكەكەش ئەوەیە كە دوای تەواوبوونی گەشتەكەت دەتوانیت لاشەو مەكینەكە لەشوێنێكی تایبەت دابنێیو بەشەكانی تریش بەخێرایی لەسەر ڕێگا هەڵدەگیرێت لەشوێنێكی ماڵ دادەنرێت بەهۆی ئامێرێكەوە، ئەم ئۆتۆمبیلە توانای سواربوونی چوار نەفەری هەیە، خێراییەكەشی دەگاتە ٥٠/كم لەكاتژمێرێكدا.

Engineerazher@yahoo.com

## کاروانی زانستی

# دوو دکتۆراو دوو ماستەرنامە

**لەسایەی پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان و بەرقەراربوونی ئەو ئاشتی و ئازادییەی باڵی بەسەر کوردستاندا کێشاوە، هەروەها هەڵاتنی رۆژێکی نوێ لە سەرتاسەری عێراق. رۆژ لەدوای رۆژ پرۆسەی زانست و خوێندنی باڵا گەشەدەکات. قوتابیانمان خوێندنی باڵا لە بوارە زانستییە جیاوازەکان تەواودەکەن و بڕوانامەی بەرزبەدەست دێنن.**
**بەناوی گۆڤاری (ئەندازیار) پیرۆزباییەکی گەرم لەم بەڕێزانە دەکەین و هیوای تەمەن درێژی و بەردەوامیان بۆ دەخوازین لەخزمەتی زانست و گەشەپێدان و پێشخستنی وڵاتەکەمان.**

کاروانی زانستی ئەمجارەمان لەم بەڕێزانە پێکدێت:

**د. شەونم رەشید جەلال.**

**د. محەمەد عارف**

**م. جەلال جەمال حەمەدەمین**

**م. عەبدولجەلیل عەزیز محەمەدەمین**



**١- دکتۆرای مامۆستا (شەونم رەشید جەلال):**
شەونم رەشید جەلال لەساڵی ١٩٨١ بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لەبواری ئەندازیاری کانزاکان لە زانکۆی تەکنەلۆجی وەرگرتووە، و بڕوانامەی ماستەری لە ساڵی ١٩٨٤ لەهەمان بوار لە زانکۆی تەکنەلۆجی وەرگرتووە، لەساڵی ٢٠٠١ لەخوێندنی دکتۆرا وەرگیراوەو نامەیەکی دکتۆرای لەژێر ناونیشانی (The Effect of Thermo mechanical treatment on Mechanical Properties and Stress Corrosion cracking of Certain Aluminum Alloys) پێشکەش کردووە.

لە ٢٠٠٤/٨/٢٦ لەهۆڵی رزگاری کۆلیژی ئەندازیاری زانکۆی سەلاحەددین لەهەولێر نامەکە تاوتوێ کرا، و لیژنەی گفتوگۆ لەم بەڕێزانەی خوارەوە پێکهاتبوو:

پ.د عەبدلواحید کازم زانکۆی بابل سەرۆك

پ.ی.د وەلید جەلال زانکۆی موسڵ ئەندام

پ.ی.د شێرکۆ بابان زانکۆی سەلاحەددین ئەندام

پ.ی.د عەلی حوسێن عیوی زانکۆی تەکنەلۆجیا ئەندام

پ.پ.د عەدنان شەمغی جەبر زانکۆی تەکنەلۆجیا ئەندام

لەکۆتاییدا نامەکە بەپلەی (زۆرباشە) پەسندکرا.

گۆڤاری ئەندازیار پیرۆزبایی لە خاتوو (شەونم رشید جەلال) دەکات بە بۆنەی وەرگرتنی بڕوانامەی دکتۆرا. هیوای تەمەن درێژی و سەرکەوتنی بۆ دەخوازین لەگشت بوارەکانی ژیان و خزمەتکردنی کوردستان.

### دکتۆرا لە فەلسەفەی هونەر

رۆژی شەممە ٢٠٠٤/٢/٢٨ لەسەنتەری رۆشنبیری زانکۆی سەلاحەددین/ لە هەولێر پ.ی محەممەد عارف نامەیەکی دکتۆرای پێشکەی کرد لەژێر ناونیشانی (جوانی سروشتی کوردستان و کاریگەری لەجوولانەوەی هونەری عیراقی و هاودەمدا)



لیژنەی تاوتوێ کردن لەم بەڕێزانە پێکهاتبوو:

پ.د زوهێر ساحیب سەرۆکی لیژنە
پ.ی.د وەسما ئەلئەغا ئەندام
پ.ی.د ئیسماعیل عوبەیدی ئەندام
پ.پ.د ویسام مەرقەس ئەندام
د. عەلی عیزەددین ئەندام

و بەڕێز پ.د ماهود ئەحمەد سەرپەرشتیاری نامەکە بوو و بەڕێز پ.د ئازاد تۆفیق نوێنەری سەرۆکی زانکۆ بوو.

لەکۆتاییدا نامەکە بەپلەی ئیمتیاز لەفەلسەفەی هونەر پەسندکرا.

گۆڤاری ئەندازیار پیرۆزبایی لە پرۆفیسۆری یاریدەدەر د. محەممەد عارف دەکات بەبۆنەی وەرگرتنی بڕوانامەی دکتۆراو هیوای تەمەن درێژی و سەرکەوتنی بۆ دەخوازین لەگشت بوارەکانی ژیان بۆ خزمەتکردنی کوردستان.

## ماستەرنامەی مامۆستا (عەبدولجەلیل عەزیز محەممەدئەمین)

(عەبدولجەلیل عەزیز محەمەدئەمین) لە شەقلاوە لەساڵی ١٩٧٦ لەدایکبووەو بڕوانامەی بەکالوریوسی لەبەشی ئەندازیاری کارەبا لەکۆلیژی ئەندازیاری زانکۆی سەلاحەددین لەساڵی ١٩٩٨ وەرگرتووە، لەساڵی ٢٠٠٢ لەژێر سەرپەرشتی خوالێخۆشبوو (د. فەرەیدون هادی مەعروف) ماستەرنامەیەکی پێشکەش کردووە لەژێر ناونیشانی:

(Line of Sight VHF UHF propagation in Erbil City)

لە ٢٠٠٤/١/٨ لەکۆلیژی ئەندازیاری زانکۆی سەلاحەددین لەهەولێر نامەکە تاوتوێ کرا، و لیژنەی گفتوگۆ لەم بەڕێزانەی خوارەوە پێکهاتبوو:

م. ئەمین عەباس پرۆفیسۆری یاریدەدەر سەرۆک
د. ئیبراهیم ئیسماعیل حەمەڕەش مامۆستا ئەندام
د. مزەفەر مستەفا پرۆفیسۆری یاریدەدەر ئەندام

لەکۆتاییدا نامەکە بە پلەی (باش) پەسندکرا.



گۆڤاری ئەندازیار پیرۆزبایی لەمامۆستا (عەبدولجەلیل عەزیز محەمەدئەمین) دەکات بەبۆنەی وەرگرتنی بڕوانامەی ماستەر لەبواری (ئەندازیاری کارەبا)، هیوای تەمەن درێژی و سەرکەوتنی بۆ دەخوازین لەگشت بوارەکانی ژیان و خزمەتکردنی کوردستان.

## ماستەرنامەی مامۆستا (جەلال جەمال حەمەدەمین)

(جەلال جەمال حەمەدەمین) بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لەبەشی ئەندازیاری کارەبا (ئەلکترون و گەیاندن) لەکۆلیژی ئەندازیاری زانکۆی سەلاحەددین لەساڵی ١٩٩١ وەرگرتووە، لەساڵی ٢٠٠٢ لەژێر سەرپەرشتی (د. عیماد شەهاب ئەحمەد) ماستەرنامەیەکی پێشکەش کردووە لەژێر ناونیشانی:



(Comparative Study of polyphase codes for CDMA)

لە ٢٠٠٤/٩/٦ لە زانکۆی تەکنەلۆجی لەبەغدا نامەکە تاوتوێ کرا، و لیژنەی گفتوگۆ لەم بەڕێزانەی خوارەوە پێکهاتبوو:

د. وەلید ئەمین ئەلجەوهەر زانکۆی بەغدا سەرۆک
د. ڕەفعەت تالب حوسێن زانکۆی تەکنەلۆجی ئەندام
د. حوسێن کامل جایل زانکۆی تەکنەلۆجی ئەندام.

لە کۆتاییدا نامەکە پەسندکرا.

گۆڤاری ئەندازیار پیرۆزبایی لەمامۆستا (جەلال جەمال حەمەدەمین) دەکات بە بۆنەی وەرگرتنی بڕوانامەی ماستەر لەبواری (ئەندازیاری گەیاندن)، هیوای تەمەن درێژی و سەرکەوتنی بۆ دەخوازین لەگشت بوارەکانی ژیان و خزمەتکردنی کوردستان.



# ئەندازیارە جیهانییەکان

ئا: ئەندازیار فریاز جەعفەر

### × جۆن ناش Nash, John

ئەندازیارێکی بیناسازی بریتانییە (١٧٥٢-١٨٣٥) نەخشەسازی شەقام و پارکی (ریجنت)ی کردووە لەشاری لەندەن، هەروەها بەشداری لە فراوانکردنی قەڵای (بەکنگهام) کردووە. ناش نەخشەسازی بۆ زۆر لە شوێنە ناودارەکانی لەندەن کردووە لەوانەش نیوەبازنەی مەرمەڕی ماربل ئارش (Marble Arch) کە دەکەوێتە کۆتایی شەقامی ئۆکسفۆرد.



### × ئەرنست فیرنەرفون زیمنز: Siemens, Ernst Werner Von

ئەندازیارێکی کارەبای ئەڵمانییە (١٨١٦-١٨٩٢) زۆر داهێنانی هەیە لەبواری ئەندازیاری کارەبا، لە گرنگترینیان: پێشخستنی گەیاندن و گینەرەتۆری کارەبا. و لەگەڵ براکەی (سێر ولیام) بەشداریکردووە لە بنیاتنانی دەزگای (زیمنز - هلسکە) لەبەرلین ساڵی ١٨٤٧ کە تاکو ئێستا ئەم کۆمپانیا ئەڵمانیە تایبەتە بە دروستکردنی کەلوپەلی کارەباو ناودارییەکی جیهانی گەورەی هەیە(Siemens).



هەروەها ناوی سیمنس خرایە سەر یەکەی (مسامحە)ی کارەبا کە دەکاتە پێچەوانەی یەکەی ئۆم (١ سیمنس = ١/ئۆم). جێی ئاماژەیە کە ئێستا خەڵك دەڵێ سیمنس لەبری زیمنز ئەوەش لەبەر کاریگەری زمانی ئینگلیزی.

### × جۆرج ستیفنسۆن Stenvenson, George

ئەندازیرێکی میکانیکی و داهێنەرێکی ئینگلیزییە (١٧٨١-١٨٤٨) لە بنەماڵەیەکی هەژار لەدایکبووە کە باوکی پۆلیسی ئاگرکوژێنەرەوە بوو، و زۆر ماندووبوونی دیووە تاوەکو خوێندن تەواوبکات و زۆر کاری کردووە لەو پێناوەدا. دوای دەرچوون (مەکینەیەکی هەڵمی) ناوداری داهێناوە کە بەناوی خۆی کراوە، دواتر (چرای سەلامەت)ی دروستکردووە بۆ کانەکانی ژێرزەوی (المناجم)، لەهەمان کاتدا کە دیفی ئەم چرایەی دروستکردووە، چەندین جۆر لەشەمەندەفەرو هێڵی ئاسنی شمەندەفەری بۆ بەرژەوەندی میری دروستکردووە.





### × جۆن سمیتون Smeaton, John



ئەندازیارو داهێنەرێکی ئینگلیزییە (١٧٢٤-١٧٩٢) هەرچەندە ئەندازیاری شارستانی بووە، بەڵام سمیتون زۆر ئامێری بەکارهاتوو لەبواری کەشتیوانی و گەردوناسی پەرەخستەوە، دووبارە ساڵی ١٧٥٦ (چیمەنتۆی هایدرۆلیکی دۆزیوەتەوە)، کە دوای رووخانی رۆما لەپێش زایینەوە بەکارنەدەهات و خەڵك لەبیریان کردبوو، ئەمە جگە لە داهێنانی ئامێرێك بۆ کونکردنی ئاسن.

سیمۆن میدالیای زێری بەدەست هێنا لەسەر رۆڵی کاریگەری لەپەرەخستنی ئاشی هەواو ئاشی ئاوی، زۆر داهێنانی بیناسازی گەورەی هەیە کە لە گرنگترینیان بالەخانەی (رامزگێت هاربر)ە (Ramsgate Harbour) لەساڵی ١٧٧٤.

# ئەندازیاری کارامە

**وێستگەکانی بەرهەمهێنانی وزە لە کوردستان بەپەنجەی دەست دەژمێردرێن بەڵام زۆر گرنگن و هەموو ئابووری و پیشەسازی کوردستانی لەسەر دەوەستێ، بۆیە هەر تێکچوونێك لەم وێستگانە لەوانەیە پارێزگایەك بێ کارەبا بکات.**

هەرچەندە (٣) وێستگە (٢٩) مێگاواتی‌یەکەی کوردستان بەرهەمێکی زۆر وزەیان نی‌یە بەڵام بونەتە کۆڵەگەیەك لە دابینکردنی کارەبا بۆ پرۆژە سەرەکی‌یەکان (ئاو، نەخۆشخانە..هتد) بۆیە لە کارکەوتنیان بارێکی قورس دەخاتە سەر تۆڕی کارەبای کوردستان.

ئەوەتا لەماوەیەکی کەمدا هەردوو وێستگەی هەولێرو سلێمانی لەکارکەوتن و بارێکی نائاسایی پەیدابوو، و دوای پەیوەندی کردن بە کۆمپانیا تایبەتیەکان بڕێکی زۆر پارەو کاتێکی زۆریان ویست کە ئەمەش نەدەکرا، بۆ چارەسەری ئەم کێشەیەش ئەندازیارێکی کوردی لاو هاتە مەیدان و هەموو منەت و بەها زۆرەکانی ئەم کۆمپانیا تایبەتیانەی کردە بلقی سەرئاو.

ئەندازیار هەڤاڵ ئەحمەد موستەفا لەدایکبووی ١٩٦٩ی شاری هەولێرە، دەرچووی بەشی میکانیکی کۆلیژی

چارەسەری گرفتەکە، ئەوەبوو لە ٩/١٦ کۆمپانیاکە داوای بەشە تێکچووەکانی کرد بەمەبەستی چاککردنەوە، بەشە تێکچووەکان کە بریتی بوو لە کارتی ئەلیکترۆنی (CPU) و (CIE) بەهۆی رێکخراوی UNDP لە ٢٠٠٣/١٠/١ ناردران بۆ عەممانی پایتەختی ئوردن، ئەوەبوو بەرپرسی UNDP لە عەممان وەڵامی ناردەوە کەوا ئەم کارتانە لەلایەن BWSC چاك ناکرێتەوە بەڵکو پێویستە بۆ کۆمپانیای ABB بنێردرێن و ئەوانیش داوای بڕی (٥٢٠٠) دۆلاریان کردو ماوەی دوو هەفتەیان دانا بۆ چاککردنەوە. ئەوەبوو لە ٢٠٠٤/١١/٢٠ و دوای گەشتێکی (٥٠) رۆژی کارتەکان هاتنەوە هەولێر و بڕی پارەکەش درا بە کۆمپانیای ABBو هەرچەندە رێنماییەکانی کۆمپانیای ABB جێبەجێکرا لەچۆنیەتی دانانەوەی کارتەکان لەشوێنی خۆی بەڵام بێ هودەبوو، دواتر چەند رێنماییەکی تریان نارد بەڵام هەر فایدەی نەبوو، ئەوسا لە ٢٠٠٣/١١/٣٠ کۆمپانیای BWSC داوای زانیاری زیاتریان کرد سەبارەت بە کێشەکە.

ئەندازیاری زانکۆی سەلاحەددینە لەساڵی ١٩٩٦، لەساڵی ١٩٩٨ لەبەشی مۆلیدەکان لەبەڕێوەبەرایەتی دابەشکردنی کارەبای هەولێر دامەزراوە.

دواتر لەگەڵ دروستکردنی وێستگەی ٢٩ مێگاواتی هەولێر گواستراوە بۆ ئەوێ و وەکو کادرێکی کارامە لەوێ دەست بەکاربووە.



لە ٢٠٠٣/١٢/٦ ئەندازیار هەڤاڵ دەستی بە پشکنینی ورد کرد لەسەرتاسەری سیستەمی کارکردنی یەکەی (٢)، و گەیشتە ئەو ئەنجامەی کەوا ئەم کێشەیە لە ئەنجامی نەمانی پرۆگرام لەسەر کارتی (CPU)ی یەکەکە رووی داوە، بۆیە بەپشتیوانی خوا دەستی بە پرۆگرامکردنەوەی کارتەکە کردو دوای هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر لەهەمان رۆژدا ١٢/٦و لەکاتژمێر ١٢ی نیوەشەو یەکەکە کەوتەوەکار بەوپەڕی چووستی و بەبێ وەستان تاکو ئێستا.

## وێستگەی ٢٩ مێگاواتی هەولێر

لەبەرواری ٢٠٠٣/٩/٨ یەکەی ژمارە (٢)ی وێستگەکە راوەستا، ئەمەش لەبەر تێکچوونی پرۆگرامی ئەم یەکەیە، دواتر لە ٩/٩ پەیوەندی کرا بە کۆمپانیای دروستکەر (BWSC)، ئەوانیش داوای زانیاریەکی تەواویان کرد بۆ

## وێستگەی ٢٩ مێگاواتی سلێمانی

لە ٢/٢٦ وێستگەی ٢٩ مێگاواتی سلێمانی بەتەواوەتی لەکار وەستا، ئەمەش لەئەنجامی تێکچوونی کارتی CPU لەبەشی ئەلکتریکی یەکەیەك، بەڵام لەبەرئەوەی سێ یەکەی تریش بە

کۆمپیوتەر کاردەکەن ئەوانیش وەستان، ئەوەبوو پەیوەندی کرا بەچەند کۆمپانیایەك کە لە دروستکردنی وێستگەکە کاریان کردبوو بەمەبەستی چارەسەرکردنی، بڕیاردرا کە لەماوەی دوو رۆژدا دوکەس کاری تێبکەن و هەگریەکەیان بڕی (١٤) هەزار دۆلار وەرگرن (واتا گوژمەی ٢٨ هەزار دۆلار) بەلأم ئەم بەلێنە گرەنتی تێدانەبوو! !

ئەوەبوو هەواڵی کارامەیی (هەڤاڵ) بەوێ گەیشتبوو لەرێگای بەرێز بەرێوەبەری بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا، کارەبای هەولێر ئاگادارکرایەوە بەمەبەستی چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە ئەوەبوو ئەندازیار هەڤاڵ چووە سلێمانی و رۆژی ٢٠٠٤/٤/١٠ کاتژمێر ١٠ی شەو (دوای ٨ کاتژمێر کارکردن) توانی تێکچوونەکە چاك بکاتەوە دووبارە وێستگەکە بخاتەگەڕ.

## مەشقی بەردەوام

ئەندازیار هەڤاڵ ئێستا بەرپرسی بەشی مەشق و راهێنانە لە وێستگەی ٢٩ مێگاواتی هەولێر و بەردەوامە لە خولکردنەوە بۆ ئەندازیاران لەسەر بنەمای خولەکانی **BWSC** (خولی یەکەم بۆ ٢٦ کارمەندی کردەوە — ١٠ ئەندازیارو ١٦ تەکنیکار)، ئەمەش بەمەبەستی شارەزابوون و پێشخستنی ئاستی زانیاری، هیوای وایە کەئەم خولانە بەشێوازیکی مۆدێرنی پێشکەوتووی بەردەوام بکات.

ئەندازیار هەڤاڵ لەگەڵ ١٢ لە ئەندازیارانی کوردستان لە ٢٠٠٤/٦/١٦ بەرەو دانیمارك کەوتەڕێ بەمەبەستی شارەزابوون لەبواری (PLC) ئەمەش بەبینینی خولێکی سێ هەفتەیی لەبوارەکانی **(Sattline Program & Logic Control)** خولەکەش لەبارەگای کۆمپانیای BWSC لەشاری کۆبنهاگن کرایەوەو مامۆستایانی پسپۆری نێودەوڵەتی خولەکەیان بەرێوەدەبرد، دوای تەواوبوونی خولەکە بڕوانامەی تایبەت بەم خولە بەسەر ئەندازیاران دابەشکرا.

هیوادارین کە نمونەی هەڤاڵ زۆربێت و هەموو ئەندازیارێك هەڤاڵ بێت بەمەبەستی ئاوەدانکردنەوەی کوردستان و پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بەردەوام بۆ ژێرخانی ئابووری کوردستان، دەخوازین فەرمانگەی کارەبا زیاتر بایەخ بەم ئەندازیارە بەهرەدارانە بدات و خولی بەردەوامیان بۆ بکاتەوەو زانستیان دەوڵەمەندتر بکات، چونکە ئەوانە سامانێکی گرنگن و جێی شانازی ئەندازیارانی کوردستانن.■

## روونکردنەوەیەك

گۆڤاری ئەندازیار روونکردنەوەیەکی لەبەرێز ئەندازیار (ماجد عەبدال) بەدەست گەیشت کە تیایدا باس لە کێشەیەک دەکات، ئێمەش لە سۆنگەی پاراستنی مافی دانەرو لەدیدی باوەڕبوون بە ئازادی بیروڕا، گۆڤارەکەتان ئەم نامەیە وەکو خۆی بڵاودەکاتەوەو لەهەمان کاتدا مافی لایەنی بەرامبەر دەدات بە وەڵامدانەوە.

بەرێز سەرنووسەری گۆڤاری ئەندازیار

ب/ روونکردنەوە




لەژمارەی (٦،٥)/٢٠٠٤ی گۆڤاری ئەندازیار، بابەتێك بڵاوکراوەتەوە بەناوی ئەندازیاری راوێژکار (موئەیەد عەتاڵلا)، لەژێر ناوی چەپکە زانیارییەکی گرنگ بۆ ئەندازیارانی شارستانی، بەلأم بەرێزتان ئاگادار دەکەمەوە کە ئەو زانیارانەی ناوی دەقاودەق لە ئامیلکەی SHABAN وەرگیراوە کە ئامادەکردنی خۆمە، و بۆ یەکەم جاریش لە سالی ٢٠٠٠ بلاوم کردەوە،و ئەوەی شایانی باسە کە من بۆ کارئاسانی هێندەك لە ئەندازیارانی فەرمانگەکان ئەو زانیارانەم لەسەر Flopy Diskش داوە بەو ئەندازیارانە، بەلأم بەداخەوە کە نووسەری ئەم بابەتەی سەرەوە هیچ ئاماژەیەکی بەناوی من نەکردووە، وەك سەرچاوە یان سوود وەرگرتن، لە زانیاریەکانی ئامیلکەکەی من، بۆیە داوا لەبەرێزتان دەکەم کە لە ژمارەی داهاتووی گۆڤارەکەتاندا، ئەم روونکردنەوەم بۆ بڵاوبکەنەوە.

لەگەڵ رێزوسوپاس

**ئەندازیار ماجد عەبدال شعبان**

هاوپێچ: دانەیەك لە ئامیلکەی SHABAN

# بەهرەیەکی وەرزشی

**بەهزاد زەینەدین مەولود، قوتابی بەشی شارستانی کۆلیژی ئەندازیاری – زانکۆی سەلاحەددین، نمونەیەکی گەشی بەهرە هەمەلایەنەکانی ئەندازیارانە، ئەوەتا بەهزاد بەماوەیەکی کورت توانی لە فێرخوازێکی یاری شەترنج شوێنی خۆی لەریزی هەڵبژاردەی لاوانی عیراق بکاتەوە..**



**با لە نزیکەوە ئەم پاڵەوانە بناسین:**

بەهزاد لەدایکبووی ١٩٨٤ی شاری کۆیەی خۆشەویستە، سەرەتا تەمەنی یازدە ساڵی (١٩٩٥) بە سەیرکردن فێری ئەلف و بێی یاری شەترەنج بووە، ئەوەش کاتێ براکانی کاتی پشوی خۆیان بەم یاریە بەسەر دەبرد هەر بەوەندەش نەدەوەستان (بەڵکو ئەم یارییە زۆر خۆشەویستە لەلایەن کۆییەکان، بۆیە گەنجەکانی کۆیە لە باخچەی گشتی و شوێنەکانی تر خولی ناوەخۆیان لە پێشبڕکێ دەکردەوە. ئەوەبوو ساڵی ١٩٩٦ کاك بەهزاد هاتە هەولێرو لەسەر دەستی کاك ئەمجەد حەمەی یاریزان چووە یانەی ئاسۆ بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی زانستی فێری ئەم یارییە بێت.

دواتر لەسەر دەستی یاریزانان جەلیل شەریف لە یەکێتی شەترەنجی هەولێرو سەلاحەددین حەمادی لەیانەی ئاسۆ فێری سەرەتاکانی تەکنیکی یارییەکە بوو.

ساڵی ١٩٩٧و لەیەکەم بەشداری لە خولی کراوەی یانەی ئاسۆ و بەبەشداری زیاتر لە ٥٠ یاریزان پلەی دووەمی بەدەست هێنا.

ئینجا وەکو یاریزانێك لەیانەی ئاسۆ بەشداری لەچەندین خول و پاڵەوانیتی کردو پلەی چاکی بەدەست هێناوە.

ساڵی ١٩٨٨ لەگەڵ یانەی ئاسۆو لەمیانەی پاڵەوانیەتی پالأوتن لەپلەی دوو بۆ پلە یەک بەشداری کردووەو پلەی باشیان بەدەست هێناوە.

لەم ماوەیەدا لەزۆربەی خول و پاڵەوانیەتەکان بەشداریکردووەو پلەی باشی بەدەست هێناوە، دواتر لەگەڵ زۆربەی یانەکانی هەولێر یاری کردووە (هەولێر، هێرش، خانزاد) تاوەکو ساڵی ٢٠٠١ کە یانەی خانزاد دوا مەنزڵگای بووە لە ٢٣-٢٠٠٤/٢/٢٨ یانەی هەولێر (دوای دوورکەوتنەوەی ١٥ ساڵ لەم پاڵەوانیەتیە) بەشداری لە پاڵەوانیەتی (فئات عمری) عێراق کردووە، کاکە بەهزاد لە فئەی ٢٠ ساڵی بەشداریکردووەو شوکور بۆ خوا پلەی یەکەمی بەهاوبەشی لەگەڵ محەمەد نۆفەل لە یەکێتی شەترەنجی موسڵ (بەڵام یاریزانی یانەی زەورایە) بەدەست هێناوە، ئەمەش دوای ئەوەی توانی لەو یاریانەی کە سیستەمی دەولی تێدا بەکاردێت (٧) خاڵ کۆبکاتەوەو بەمەش بووە پاڵەوانی لاوانی عیراق و کورسیەکی لە هەڵبژاردەی عیراق بەدەست هێنا.

**پاڵەوانیەتی دیکە:**

وەنەبێ کاکە بەهزاد هەر لەم پاڵەوانیەتە بەشداری کردبێت بەڵکو لەگەڵ یانەی خانزاد لە چەندین پاڵەوانیەتی بەشداریکردووە لەوانەش :

* پاڵەوانیەتی یانەکانی هەرێمی کوردستان بەبەشداری زیاتر لە (٥٠) یانە لەسەرتاسەری کوردستان کە پلەی یەکەمیان بەدەست هێناوە.

* پاڵەوانیەتی پلە یەکی یانەکانی عێراق و توانیان پلەی دووەم لەسەر ئاستی عێراق بێنن، جێی ئاماژەیە کە پلەی یەکەم لەلایەن یانەی (هێرش)ی هەولێر تۆمارکراو پلەی سێیەم بووە هی (زەورا)ی بەغدا، جێی باسە کە ئەم پاڵەوانیەتیە بەبەشداری (١٥) یانەی پلە یەکی عێراق ئەنجامدرا.

سەرەڕای وانە قورسەکانی کۆلیژ کە لە قۆناغی یەکەمی بەشی شارستانی‌یە، کاکە بەهزاد توانیویەتی بەهۆی خشتەیەکی ڕێك و پێك کاتی تایبەت بۆ هەریەکە لە وەرزش و خوێندن دابنێت.

کاکە بەهزاد ئەم جۆرە وەرزشەی هەڵبژاردووە چونکە هەست بەپەیوەندیەکی توندوتۆڵ دەکات لەنێوانیان چونکە یاریزان دەبێت بەشێوەیەکی ئەندازەیی مامەڵە لەگەڵ بەردەکانی یاریەکە بکات.

یاری شەترەنج ئێستا لەسەرتاسەری جیهان شوێنێکی تایبەتی گرتووەو

گەورەترین کۆمپانیاکانی جیهان سەرقاڵی ئامادەکردنی بەرنامەی کۆمپیوتەری تایبەت بەم بوارەدا بەڵام تائێستا هەستی مرۆڤایەتی و ژیری و پاڵەوانانی جیهانی سەرکەوتووتر بوو بەسەر ئامێری دەستکردو توانیویەتی گرەو بباتەوە، ئەمەش بەرای کاکە بەهزاد بۆ ژیرو دانایی پاڵەوانە جیهانیەکان دەگەڕێتەوە چونکە هەرچەندە ئەم کۆمپیوتەرانە وا نەخشەیان بۆ سازدراوە کە بتوانن لەیەك چرکەدا چەندین ملیۆن جولە بکەن بەڵام کۆمپیوتەرە خواییەکەی مێشکی یاریزانەکان توانیویەتی ئەم تەڵەسمانە شیکار بکات و سەرکەوتن تۆماربکات.

هەرچەندە شاری هەولێر بەدرێژایی مێژوو ئەسپی خۆی لەبواری ئەم یارییە تاوداوە و توانیویەتی پێشەنگی عیراق بێت، بەڵام ئەوەی هەستی پێوەدەکرێت کە بەشێوەی پێویست پاڵپشتی لێوەناکرێت و ئەگەر پشتگیریشی لێوەبکرێت ئەوا شتێکی ریکلامییەو لەبواری راگەیاندن بترازێت هیچی تیا نییە، نموونەش ئەو سەرکەوتنانەی دواییە کە تەنانەت لە راگەیاندنیش هەقی خۆی نەدراوەتێ.

ئێمە لە گۆڤاری ئەندازیار ئەم هەلە بەچاك دەزانین کە داوا لە ئەنجومەنی باڵای وەرزشی بکەین کە گرنگییەکی زیاتر بەم وەرزشە بدات چونکە هەولێر یاریزانی زۆر بەتوانای پێشکەش بە عێراق کردوە لەم بوارەدا.

هیوادارین کە کاك بەهزاد بەبیرێکی ئەندازەیی مامەڵە لەگەڵ وەرزش بکات و ئەندازیارێکی شارستانی بەتواناو پاڵەوانێکی شەترەنجی جیهانی لێ هەڵکەوێت و لەهەردوو بواردا بتوانی ناوی کوردو کوردستان بەرزبکاتەوە. ■

## ماڵپەڕی ئەندازەیی

**ئەندازیار: هۆشیار عەزیز بەکر**

**بە پێویستمان زانی لەم چەند دێرەدا گرنگترین ماڵپەڕی تایبەت بە کۆمەڵەو دەستەو کۆمپانیای ئەندازیاری نێودەوڵەتی کە بەکەڵکی ئەندازیاراندا دێت یاداشت بکەین:**

* www.aaes.org

ئەم ماڵپەرە تایبەتە بە رێکخراوی ئەمریکی بۆ کۆمەڵە ئەندازەییەکان.

* www.asme.org

کۆمەڵە ئەندازیارە میکانیکییەکانی ئەمریکی

* www.memagazine.org

ئەم ماڵپەڕە تایبەتە بە گۆڤاری ئەندازیارە میکانیکییەکانی سەر بە کۆمەڵەی ئەندازیترە میکانیکیەکانی ئەمریکی.

* www.nspe.org

ئەم ماڵپەڕە تایبەتە بە کۆمەڵەی ئەندازیارە پسپۆڕەکانی جیهانی

* www.energy-trading.com

ئەم ماڵپەڕە تایبەتە بە گۆڤاری ئەندازیاری وزەی جیهانی

* www.nae.edu

ئەم ماڵپەڕە تایبەتە بە ئەکادیمیای جیهانی ئەندازیاران

* www.ndt.org

ئەم ماڵپەڕە تایبەتە بە بنکەی تاقیکردنەوەکان Destrictive Test Now

* libweb.macarthur.uws.edu.au/int_sci.htm

ئەم ماڵپەڕە تایبەتە بە شوێنی زانستی ئەندازیاری لە بوارەکانی گەرووناسی و کیمیاو فیزیا.

* www.wrenuk.co.uk/menu.htm

ئەم ماڵپەڕە تایبەتە بە تۆڕی جیهانی نوێکاری وزە.



* www.wspc.com/index.htm

ئەم ماڵپەڕە تایبەتە بە جیهانزانی وزە

* www.energy.com

ئەم ماڵپەڕە تایبەتە بە جیهانی وزە

* www.abb.com

ئەم ماڵپەڕە تایبەتە بە کۆمپانیای ABB

* www.ge.com

ئەم ماڵپەڕە تایبەتە بە کۆمپانیای جەنەڕال ئەلەکتریك.

* www.mitsubishi.com/index_e.htm

ئەم ماڵپەڕە تایبەتە بە کۆمپانیای میتسوبیشی.

* www.hitachi.com

ئەم ماڵپەرە تایبەتە بە کۆمپانیای هیتاشی.

## سمۆرەی ئاوی -قوندوس-

# ئەندازیاری بەنداوو رۆگە ئاوییەکان





**کاوە عەبدولکەریم خۆشناو**
**ماستەر لە ژینگەی کشتوکاڵی**
**مامۆستای کۆلیژی کشتوکاڵ/ زانکۆی سەلاحەددین**

**ئاژەڵێکی شیردەری جوان لە کیشوەری ئەمەریکای باکوور دەژیێت - جگە لە خوارووی رۆژئاوای مەکسیک- تایبەتمەندییەکی هەیە کە رۆگەی زێ و رووبار دەگرێت بەدروست کردنی بەنداو لە قەدولکی دارو قوڕولیتەو دەبێتە هۆی نزکردنەوەی تێکڕای رەوتی ئاوو بەوەش داشۆڕانی خۆڵی کە دەوڵەمەندە لەمایەی ئۆرگانی و خۆراک رادەگرێت.**

**ئەم ئاژەڵە چییەو نهێنی ئەم بەنداوانە چین؟**

ئەم ئاژەڵە لە تیرەی شیردەرەکان و پێگەی قرتێنەرەکانە ناوی زانستی Caster Candencis بەئینگلیزی پێی دەڵێن Beaver واتە سمۆرەی ئاوی (قوندس) لە گەورەترین جۆری قرتێنەرەکانی ئەمەریکای باکوورە، تێکڕای درێژی رەسیوەکانی چوارپێ



دەبێت و هەریەکەیان ٦٠ پاوەند گرانیەتی و رەنگی پشتی و تەنیشتەکانی خۆڵەمێشیی تێرەو سینەو کەمەری کاڵن، پێی پێشەوەی کورت و چرنووك تیژن بۆ هەڵکۆڵین و پاك کردنەوەو پەناگە دروست کردن باشن هەروەها بۆ گواستنەوەی لکەدار، پێی دواوەی گەورەترن و لەنێوان ئەنگوستەکانیدا پەردەی پێستی هەیە یاریدەی دەدات لەمەلەکردن و کلکی تا رادەیەك گەورەو پانە بێ موو فەروەیەو کە باز دەداتە ناو ئاو بەشەپەی کلکی دەناسرێتەوەو جوانەو یاریدەی دەدات لە مەلەو ئاراستەکردنی دارو لکەدار لەنێو ئاودا، فەروەکەی ئەستوورەو تەڕنابێت بەوەش لەسەرماو سۆڵەی بەفری ئالاسکاو ئەمەریکای باکوور دەیپارێزێت. چاوی بچووکن و یاریدەی دەدەن لەبینین لەسەرو لەژێرئاودا، هەستەوەری بۆن و



بیستنی زۆر بەتوانان، سەرەڕای دەزگایەکی ئۆرگانی بۆ داخستنی دەرچەی هەوا لەکاتی باوبوون و خواردن و جوین لەژێر ئاودا کە توانای هەیە بۆ ٢٠ دەقیقە بناوبێت. دوو ددانی تیژی لەپێشەوە هەیە بۆ بڕینی دار، توانای درێژبوونی هەیە. ئەم ئاژەڵانە لەنزیك زێی رووبارو دەریاچەو قۆپیاندا دەژین لە ئەمەریکای باکووردا. توانایەکی گەورەیان هەیە لە گۆنگە هەڵکۆڵین. هەندێ جار بەکۆمەڵ کاردەکەن لەداربڕیندا. ئەم ئاژەڵە بەژنی دارەکە دەبڕێت، بەلام بەلێزانی و کارامەیی

سەرەتا لەلایەکی دەست پێدەکات دواتر دەگوازێتەوە بەرامبەری لە ئاستێك لەخوار لایەکەی دیکە لە چەند ئینجێك دواتر نێوان هەردولاکە هەڵدەکۆڵێت کە لەکە یان دارەکە بەلادادێت بەکلکی هێما بۆ سمۆرە ئاوییەکانی دیکە دەکات کە نزیکن تا دوورکەونەوە لەشوێنی کەوتنی دارەکە شایانی باسە وەك ئەوەی هەر لەسەرەتاوە کە دەست بەبرینی دەکات دەزانێت دەکەوێتە کوێ.

دواتر دارەکە کەرت کەرت دەکات بۆ پارچەی جیاجیا بەپێی پێویست، دواتر ئەم پارچانە کۆدەکاتەوە لە رۆگەی زێیەکەدا و بەیەکەوە بەستنی دارولکەکان بە قوڕ دەبێت و بەشێوەیەکی ئەندازەیی و رێکوپێك. بەم جۆرە سمۆرەی ئاویی بەنداوێك لە قەدولکی دار دروست دەکات.



جێی ئاماژە پێکردنە هەندێ رۆگەو ئاوەڕۆ لەنێوان دارەکاندا دەمێنێت.

لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام و رۆژانە کاری چاك کردنەوەی ئەم بەنداوانەی لەئەستۆدایەو رۆژانە قەدولکی داری نوێی پێویستە بۆ داخستنی ئەو شوێنانەی




کەبەهۆی تەوژمی ئاوەکە دەبنەوە. سمۆرە ئاوییەکان لەنێوەند ئەم کۆمەڵە قەدولکانەدا گومەزێك لەقوڕودار دروست دەکات و بەقولی دای دەپۆشێت لەناوەوەو لەدەرەوە بۆ پاراستنی خۆیان لەوەرزی زستاندا، ئەم گومبەتە گەورەیە شوێنی چالاکی کۆمەڵایەتیانە. شوێنی تاکەکیان ژووری شێوە قووچەکین. تونێل و رۆگەی کە دەگاتە گومەزەکە، ٦-٢٠تونێل دەبێت لەنێوان ژوورەکانیان و گومەزەکەدا کە لەناوەندی بەنداوەکەدا دروستی دەکەن.



ئەم ئەندازیارە خۆرسکە ئەوە لەبیرناکات دەریچەی چوونەدەریان تونێلی باری ئاکاو دروست بکات. ئەم دەریچانە لەهەموو شوێنێکدا دروست دەکات، سەرەرای ئەوەش رۆگەی ئاوی دروست دەکات لەنێوان بەنداوەکان بۆ گواستنەوەی خۆراك و کەرستەی بەنداوسازی.

ئەم بوونەوەرانە سوودی ژینگەییان بووە، هۆیەك بوون لە رێگرتن لەلافاوی زێکان لە وەرزی بەفر توانەوەو راماڵینی خۆڵ. دوای ئەوەی ئەم ئاژەڵانە کەوتنەبەر شالاوی راوکردن بەهۆی بەهای فەروەکەی ئەم گیروگرفتانە لە ئالاسکاو کەنەدا سەریان هەڵدا. ئەم بوونەوەرە سیستەمی ژینگە دەگۆرێت لەوشوێنەی لێیە تی - بەنداوەکانیش سوودی خۆیان هەیە:

١-پەرەدان بە دەریاچەی نوێ و فرەوان کردنی و زێدەبوونی جۆری دیکەی وەك ماسی و باڵندەی ئاوی.

٢-سەرچاوەی ئاوی دیکە بەخشییە بەژینگە کە دەبێتەهۆی زێدەکردنی جۆری دیکەی رووەك .

٣-دووبارە ئەمبارکردنەوەی ئاوی ژێرزەوی.

٤-کەم کردنەوەی مەترسی لافاوی بەهێز.

٥-کەم کردنەوەی راماڵینی خۆڵ.



**سەرچاوەکان:**

1-Beaver Dam information site. www.beaverdam.info
2- Beaver management john Carlson 2001.
3- Beavers Natureworks.
4- Ecology of beavers 2003 www.ecology.info.

